## وەرچەرخانی مەزن

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەمڕۆ توانستی یەکێتی گەلان ـ لەسەر بنچینەکانی یەکسانی و ئازادی ـ دەخوڵقێ کە لەلایەن ئێوەوە گرنگییەکی زۆری پێدراوە. لەم رووەوە بەدرێژایی ژیانی شەست ساڵەی تێکۆشانی کۆمۆنیستانەتان زۆرتان ووت و لە بەشداربوونتان لەشەڕی گەریلایی (پارتیزانی) لەسەربنەمایەکی ئەنتەرناسیۆنالیستی زۆر پێش ئێمە کەوتن، تۆ لەشەڕی ناوخۆی یۆناندا گەریلایەکی بەرچاو بوویت. بەر لەوەش پەیوەندیتان بەریزەکانی پارتی کۆمۆنیستی ئەمریکاوە کردبوو. هەروەها لەنێوان ساڵانی 1940 ـ 1950دا ئەندامێکی چالاکی پارتی کۆمۆنیستی تورکیا بوویت و تا پلەی سەرکردایەتی ـ ئەندامێتی لە کۆمیتەی ناوەندی ـ هەڵکشان. لەنێوان 1950 ـ 1960دا لەو شاڵاوە رەشبگیرییە بەرفراوانەی کە گشت تورکیای گرتەوە ئێوەش دەستگیرکران، هەروەها رۆڵی کاریگەرانەشتان هەبوو لە گەشەپێدانی چەپ و جووڵانەوەی گەلێری و تێکۆشان و هەڵکشانەکانی لاوە شۆڕشگێڕەکان لەنێوان 1960 ـ 1970. لەئاکامی ئەمانەشدا بوونە ئامانجی سەرەکی دەسەڵاتداران. ئەو تێکۆشانەتان تا ساڵانی 1970 ـ 1980ش بەردەوام بوو. پاشان گەڕانەوە بۆ تاراوگە، ئەو کاتەش رشتبوون لەسەر هەڵوێستی بەپرەنسیپیانە، کە پێیەوە دەناسرێن. ئەمەش لەمیانەی رووبەڕوو بوونەوەتان بوو لەگەڵ سۆسیالیزمی بونیادنراودا کە لە هەڵوەشانەوەدا بوو، بەزرترین نموونەی سۆسیالیستێکی شۆڕشگێڕتان بەرجەستە کرد، بەجۆش و خرۆشێکی بێ سنووریشەوە چاودێری قەڵەمبازی 15ی ئابی 1984تان کرد کە شەڕی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان خولقاندی. لەو کاتەدا هیوا بەخش بوون، لە هەمانکاتیشدا هێزتان لێیەوە وەرگرت، هەروەها ئێوە لە هەڵسەنگاندنی راست و پرەنسیپانەدا لە پێشەوەدا بوون، بەڕادەیەك بوونە نموونە بۆ هەموو لایەك.

ئێمەش ماوەیەکی درێژە دەتناسین، بەڵام ئەم دیدارەمان لەنێو گشت دیدارەکاندا قووڵترین واتا و دەربڕینی هەیە. ئێمە ئەڵێین شۆڕشی

رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان، کەچی ئێوە هەر لەسەرەتاوە ووتتان شۆڕشی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و، بەهێزترین جووڵانەوەی شۆڕشگێڕی لە تورکیا، هەر لە یەکەم رۆژەوە هەڵسەنگاندنی ئێوە بەم جۆرە بوو: ئەو پەیوەندییەی کە بەیەکەوەمان گرێدەدات لەچوارچێوەی هاوکاری ئەنتەرناسیۆنالیستیانەمانە. پێشتریش شانازی و سەربڵندی خۆتان بۆ ئەو جووڵانەوەیە دەربڕیبوو و، دڵنیایی خۆتان نیشاندا بۆ ئەو هەوڵدانانەی ئێمە لەپێناو دیموکراسییەت و بەرەنگاربوونەوەی ئیمپریالیزم لەسەر رێگای گەیشتن بە سۆسیالیزم بۆ گەلەکەتان و گشت گەلانی تر. بێگومان ئێمە لەو تێکۆشانە گشتگیرییەی ئەو ساڵانە ئەنجامتان داوە هێزمان لێ وەرگرتووە و بۆ ئەو بەشدارییەی لەم رووەوە پێشکەشمان کردووە هەست بە بەختەوەری و سەربڵندی دەکەین.

ئەو دیدارەمان لەکاتێکدایە کە گەلانمان ـ ئەگەرچی درەنگیش کەوتبێ ـ لەسەر بنەمای تێکۆشانی شۆڕشگێڕانە لە هەوڵی مەزنکردنی یەکتری دان، بێ ئەوەی لە جەختکردنەوە لەسەر یەکسانی و ئازادیدا بمێنێتەوە، بەڵکو بەخێراییەوە بەرەو بەدیهێنانی چارەسەرییەکی کردارییانە ئاراستەی وەرگرتووە، هەر بۆئەوەش دیدارێکە گەلێك واتا و رەهەندی تایبەتی خۆی هەیە. ئەو دیدارە زۆر شادمانی کردم، بەتایبەتی کە دەتانبینم سەرەڕای بەساڵاچوونتان چوست و چالاکی لاوێتیتان پاراستووە. لەسەر ئەو بنەمایە دووبارە سڵاوت لێدەکەم و بەخێرهاتنتان دەکەم، گوێڕادێرتم و چاوەڕوانی راو بۆچوونەکانتم. بەختەوەرم کە گوێت لێبگرم و پرسەکانتان بخەنە روو و رەخنەکانتان دەربڕن و، ئێوە و گەلی تورکیا لە ئێمە ئاواتتان چی بێت بیهێننە زمان، واتە لە شەڕی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان، لەمیانەی ئەو دیالۆگەدا بەهەموو توانامەوە هەوڵ دەدەم وەلامێکی مەزن و گرنگ بەهەمووان بدەمەوە.

**میهری بەللی:** لەبەرامبەر ئەو پەیڤە هەست بزوێنانە پێویست دەکات شتێك بڵێم، بەڵام نایدرکێنم، چونکە راستی لەبەر چاوانە، چواردە ساڵ بەر لەئێستا ئەو کاتەی یەکتریمان بینی جووڵانەوەی کوردی دووچاری پارچەبوون و پەرشوبلاوی هاتبوو، وەکو ئێستا خاوەنی ئەو کاریگەرییە نەبوو، ناسیۆنالیزمی سەرەتایی لەزۆر شوێن باو بوو. لە دەرئەنجامی ئەو رەوشەدا گەلێك ئازارمان چەشت. ئەو رەفتار و کردارانەی هێزە کوردییەکان لە تورکیا کە PDK رێنمایی دەکردن، تووشی گەلێك برینی قووڵی کردین.

هەڵوێستی ئەنتەرناسیۆنالیستانەمان یەکەمین جار لە PKKدا بینی، بەتایبەتیش لەئێوەی بەڕێز ئۆجەلان کە یەکەمین کەس بوون هەر

لەسەرەتاوە تێزی ئەو ڕێبازەیان خستە روو کە دەڵێت:"هەر دوو شۆڕشی تورکیا و کوردستان هاوتەریب و ئاوێتەن و لەیەکتری جیا نابنەوە، سەرکەوتنی یەکێکیان سەرکەوتنی ئەوەی تریانە، شکستی یەکێکیان شکستی ئەوی تریانە". ئەمە زۆر گرنگە، نهێنی سەرکەوتنی جووڵانەوەکەتان بەتایبەتی لەم خاڵەدا شاردراوەتەوە. سەرکەوتنی جووڵانەوەی نەتەوەیی دیموکراسی کورد لەژێر سەرۆکایەتی ئێوەدا وایکرد کە هزری شۆڕشگێڕی ئەم سەردەمەمان ببێتە رێنیشاندەری تێکۆشانەکەی. بەدەستخستنی کاریگەری و جێگەیەکی شکۆدار لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی شتێکی رێکەوت نییە، بەڵکو دەرەنجامێکی مسۆگەری ئەو ڕێبازە راستەیە کە پەیڕەوی لێدەکەن. دوای ئەم ووتەیە پێویست بەزۆر ووتن ناکات. بەراستیش بۆ تورکیا مایەی بەختەوەرییە کە ناسیۆنالیستە سەرەتاییەکان رێبەرایەتی جووڵانەوەی کوردی ناکەن و، لەو جۆرە کەسانەش نین کە بەهەموو لەیستۆکەکان بخەڵەتێن و ببنە ئامرازێکی ملکەچی دەستی ئیمپریالیزم. خۆش بەختیە کە ئەمڕۆ ئاراستەکاری کاروباری ئەو جووڵانەوەیە، سەرۆکایەتییەکە کە پەیوەستە بە کێشەی گەلەکەی و گشت گەلانی دیکە و، بەشێوەیەکی بنچینەیی و لەسەر بنەمای یەکسانی و ئازادی گرێدراوە بەئامانجی بەدیهێنانی یەکێتی ئازادانەی نێوان هەر دوو گەلی تورك و کورد. ئەوە کانگای بەختەوەری ئێمەیە کە زوو بێ یان درەنگ، بەرفراوانترین ناوەندەکانی رای گشتی لەو راستییە تێدەگەن و، راستینەی ناوەندە فاشیستەکان ئاشکرا دەبێت کە چۆن ئەو شەڕەیان کردۆتە گۆڕەپانێك بۆ چەتەگەرێتی و دەوڵەمەندبوونێکی هەرزان و، ئەو رۆژە دێت کە هێزە نیشتمانی و ئاشتیخواز و دیموکراسیخوازەکان باڵادەست بن، باوەڕییەکی نەگۆڕم بەو راستیانە هەیە.

پێم وایە تۆ لە هەر کەسێکی تر باشتر لێکۆڵینەوەت لەسەر مێژووی کورد و پەیوەندیەکانی کورد ــ تورك و مێژووەکەی کردووە. خۆزگە لەو خاڵەوە دەستتان پێبکردایە و، منیش لەلایەن خۆمەوە هەندێ لایەنی کێشەکانی ئێستا ورد دەکەمەوە.

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان:** بەڵێ... لە رۆژی ئەمڕۆماندا پەیوەندیەکانی کورد ــ تورك هەر بەتەنها گرێ کوێرەیەك نییە، بەڵکو لەسەر بنەمای دژواترین شەڕی گەرمەوە بەدوای چارەسەریدا دەگەڕێت و لە ئاستێکدا کە خەریکە ئەقڵ و رۆحی تەواوی گەلان دەپڕوکێنێ. هەر لەخوت و خۆڕاییەوە مەسەلەکان بەو رادەیە نەگەیشتوون، چونکە هیچ دیاردەیەکی سەرسووڕهێنەر یان رووداوێکی کۆمەڵایەتی بێ پاشماوەی مێژوویی نییە، بەڵام سەبارەت بە پەیوەندی کورد و تورك، لەسەر پاشماوە مێژووییە

سەرسووڕهێنەرەکان بونیادنراوە. کردنەوەی ئەو گرێ ئاڵۆزە و بەدیهێنانی چارەسەری لەسەر تێگەیشتنێکی وردی ئەو مێژووە راوەستاوە.

هەر بۆئەوە ئەمڕۆ لەبنەڕەتدا واتای مێژوو دەگەیەنێ. ئەو تێگەیشتنە دەرەنجامێکی سروشتی تێڕوانینمانە بۆ مێژوو. بەبێ تێگەیشتن و رۆشنایی خستنە سەر ئەو پاشماوە مێژووییە، دژوار دەبێت لە راستی ئێستا تێبگەین و رۆشنایی بخەینە سەر. بۆیە ئەگەر بەکورتیش بێت هەوڵدەدەم واتای پەیوەندی کورد و تورك، بەتایبەتی قۆناخی هاتنی تورکەکان بۆ رۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئەنادۆڵ باس بکەم، لەبەر ئەوەی کەسێك نایەوێ بەهیچ شێوەیەك لە راستی ئەو پەیوەندییانە تێبگات. ئەو قۆناخە سەرەکییانەی کە ئەو پەیوەندییانە، هەر لە سەرەتاوە تا رۆژی ئەمڕۆ، پێیدا تێپەڕیون کامانەن؟ ئەو دەرەنجامە سەرەکییانەی کە دەکرێ لێیەوە بەدەست بهێنرێن چین..؟ رۆشنایی خستنە سەر ئەو لایەنانە تەنیا رۆشنکردنەوەی کێشەیەکی مێژوویی نییە، بەڵکو بەهەمان ئەندازەش مەرجێکی سەرەکی چارەسەرکردنی کێشەیەکی سیاسی زیندووی رۆژی ئەمڕۆمانە. هەربۆیە گرنگیم بەو بابەتە داوە و، بەهەموو تواناموەوە بەپێهەلگرتن لەو زانیارییە سنووردارانەم و، لەبنچینەدا بەپشت بەستن بەو راستییە لەبەرچاوانەی کە تێکۆشانمان دەریخستۆتە روو، هەوڵدەدەم هەڵسەنگاندنێك بکەم، کە لەو باوەڕەدام زۆر لە راستییەوە نزیك بێت.

بێگومان پەیوەندی کورد و تورك ئەمڕۆ لەدایك نەبووە. بەبێ تاوتوێکردنی راستی مێژوویی ئەو پەیوەندییانە، هەرگیز تێگەیشتنێکی راست بۆ مێژووی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەدینایەت. لەوەش زیاتر، راست تێگەیشتن لێی دەبێتە کلیلی تێگەیشتن لە کێشە زۆر و زەبەندەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست، هەروەها دەکرێ رۆڵێکی گرنگ ببینی بۆ دەربازبوون لەو نکۆڵیکردنە تۆقێنەرەی لەناوەندە زانستییەکانی تورکیادا هەیە. پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێت کە کۆمەڵناسی (سۆسیۆلۆژیا) و مێژوو ناسی لە تورکیادا پشت بە نکۆڵیکردنێکی تۆقێنەر دەبەستن، ئەمەش دەبێتە هۆکاری نامۆبوون و شێواندنی هزری. لەبەر ئەم هۆیە بیر و بۆچوونی ئێمە گرنگییەکی ئەکادیمی زۆری هەیە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی تا رادەیەکی دوور رۆشنایی دەخاتە سەر پەیوەندییەکانی گەلانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و تاپلەیەکی بەرزیش بناخەی مەیلە شۆڤێنیستییەکان بنکۆڵ دەکات. هەموو ئەو تایبەتمەندییانە جۆش و خرۆشێکی زیاترمان دەداتێ بۆ ئەوەی گرنگی بەو بابەتە بدەین، هەموو هیوامان ئەوەیە کە لە دۆزینەوەی دەروازەیەکی گونجاو بۆ رزگاربوون سەردەکەوین.

پەیوەندی کورد و تورك کێشەیەکی هەروا ساکار نییە کە پشتگوێ بخرێت. پەیوەندییەکی سەرەکییە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بڕوایەکی تەواتان هەبێت کە تورکەکان لە هەموو گەلێکی تر زیاتر دووچاری زۆری و زەحمەتی دەبنەوە، ئەگەر وادیاریش بێت لەئەنجامی ئەو پەیوەندییە کوردان زیاتر زەحمەتی دەبینن. ئەگەر تورکەکان چاو بە پەیوەندییان لەگەڵ کوردەکاندا نەخشێننەوە و لەسەر بنچینەیەکی ئاشتیخوازانە ئەو پەیوەندیانە راست نەکرێنەوە و، پەیوەستی ئەو سیاسەتانە بن کە لەسەر زەبر و زەنگی شۆڤێنیستانە و کوێرانە بونیادنراوە، ئەوانەی رووبەڕووی پاکتاوی ببنەوە تورکەکانی ئەنادۆڵن نەك کوردەکان، زۆر جار ئەمەم دووپاتکردەوە، بەڵام ووتەکانم بیسەریکی نەدۆزیوە، تا ئەمڕۆ رابوونە و دەڵێن:"مەترسییەکە گەورە دەبێت و گەشەدەکات". بەڵام ئەوەی ئەو مەترسییە دروست دەکات چییە؟ چ سیاسەتێك دەیخوڵقێنێ؟!، تاوتوێکردنی ئەو کێشانە لە چوارچێوەی پەیوەندی کورد و تورك گرنگییەکی زۆری هەیە. بەمەش ئەو رووناکبیرە تورکانەی بۆچوونێکی بەمجۆرەیان هەیە کە دەڵێ:" کوردەکان ئەوانەن کە شەڕی رزگاریخوازی نەتەوەیی دەکەن" ئەوان بەو لێکۆڵینەوە و لێتوێژینەوەیان لە بێ ئاگاییەکی مەزندان. ناوەندە زانستییەکانی تورکیا ــ بەتایبەتی ناوەندە سۆسیۆلۆژیەکان ـ دووچاری بێباکییەکی ترسێنەر هاتوون. من لە ئاکامی ئەو کارەیان کە پشتیوانی لەگەلی تورك ناکات، وریایان دەکەمەوە، چونکە هەڵوێستێکی بەمجۆرە مەزنترین زیانیان پێ دەگەیەنێت، هەروەها بانگهێشتیان دەکەم کە خۆیان لەو هەڵوێستە رزگار بکەن، رۆشنایی خستنە سەر ئەو پەیوەندییانە پێداویستییەکی دەست لێبەرنەدراوی بوژانەوە و هۆشیاربوونەوەیە.

**میهری بەللی:** چەندە قورسایی بخەینە سەر ئەو راستییە هێشتا کەمتەرخەمین. چارەسەری دادپەروەرانەی کێشەی کورد واتای گەیشتنی تورکیا بە ئامانجە دیموکراسییەکانی دەگەیەنێت. ئەوەش بۆ ئەو مەسەلەی مان و نەمانە. یان تورکیا بەو ئامانجە دەگات، واتە یان لەسەر بنچینەی یەکێتییەکی ئازاد و ئازادی و یەکسانی وەك کۆمەڵگایەکی مەدەنی فێری ژیان دەبێت، یان بەرەو دەرەنجامێکی ناهەموار مل دەنێت. ئەمە ئەو دووڕیانەیە کە لێیەوە راوەستاوین.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** وەك دەزانرێ، کوردان گەلێکی جێگیری هەزاران ساڵ بەر لەمێژوون. لەناوچەی میزۆپۆتامیادا نیشتەجێ بوون، کە دەکەوێتە نێوان چیاکانی زاگرۆس و تۆرۆسەوە و، خاوەنی یەکێك لە کۆنترین کولتوورەکانن. لەوەش زیاتر، زانیارییەکان سەبارەت بە مێژوو جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە

کە ئەو ناوچەیە بەیەکەوە ژیان و تێکەڵبوونی گەل و کولتوورەکانی بەخۆوە بینیوە، واتە گەلێك هۆز و خێڵ و گەلی تێدا ژیاوە و تێکەڵ بەیەکتری بوون و، بێهودەیە بەدوای نەژادێکی پاکدا بگەڕێین کە تێکەڵاوی نەژدای تر نەبووبێت. دەکرێ بووترێ کوردستان جێگەیەکی ناوەندی هەیە لە جوگرافیای بەرفراوانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لەو مۆزاییکەی گەلان کە تیایدا پێکهاتووە، گەلی کورد گەلێك رەنگی جیاوازی لەو مۆزاییکە وەرگرتووە. لەسەر ئەو بنەمایە، ئەگەر بپرسین: لە رۆژی ئەمڕۆماندا رەنگینترین گەل کامەیە...؟ بۆمان دەردەکەوێ کە گەلی کورد لە ناواخنی خۆیدا گەلێك ناو و رەسەنایەتی هەلگرتووە، ئیدی ئەگەر ناوی کوردی لێبنرێت یاخود ناوێکی تر، لەگەڵ ئاماژەکردن بەوەی کە هەر یەکێك ناوێکی جیاوازی لێدەکات. من لەمەدا هیچ لاوازی و ئیمتیازێك نابینم، بەڵام دیاردەیەکی جوانە ئەگەر لێیەوە سوودمەند بین، ئەوکاتە بەکولتوورێکی دەوڵەمەند دەگەین، کولتوورێکی تا دواڕادە رەنگین و جوان. ئینتیما بۆ گەلێکی بەمجۆرە نە شەرمە و، نە پلە بەرزییە تاوەکو بەرەو شۆڤێنیستی راپێچمان بکات. تەنها دەتوانم بڵێم کە شتێکی جوانە، ئاوێتەبوونی چەندین کولتوور و تێکەڵاوبوونی کورد و گەلانی تر لەگشت بوارەکان، بەئایین و بیر و باوەڕەکانیشەوە، هەروەها پاراستنی خۆی و زمانەکەی، شتێکی تا دواڕادە جوانە و دەبێ شانازی پێوەبکرێت.

**میهری بەللی:** لەو تێزەدا ئەوە تێدەگەین کە ئەوانەی مێژوویان خوڵقاندووە ئەو توێژە رەنجدرانەی گەلن کە لەبنجی کۆمەڵگادا ئاخنراون. شکۆداری لە مانەوەی گەلی کورد کە ئەمڕۆ خاوەن لە زمان و کولتوورەکەی دەردەکەوێ بۆ جووتیاری کورد دەگەڕێتەوە، کە بەدرێژایی سەدان یان هەزاران ساڵ لە بەرەنگاربوونەوەی گشت شێوەکانی چەوساندنەوەدا بووە، لە هەمانکاتدا لەلایەك مێگەلەکەی لەوەڕاندووە و کێلگەکەی کێڵاوە و بۆ خێزان و کەس و کارەکەشی ئەگەرچی بەشێوەیەکی سەرەتاییش بێت پێداویستی دابینکردووە، لەلایەکی ترەوە منداڵەکانی پەروەردە و گۆشکردووە و حیکایەت و گۆرانی و کەلەپوور و کولتووری کوردییان پاراستووە، سەرەڕای رەوشە سەختەکان، ئەگەر پەیوەستبوونی ئەو مرۆڤە ئاخنراوەی بنجی کۆمەڵگا بە بەها کولتوورییەکانەوە نەبووایە، ئەوا لەڕۆژی ئەمڕۆماندا نەتەوەی کورد نەدەبینرا. ئەم ووتەیە راستە و بەسەر گەلی تورك و گشت گەلانیش دەچەسپێ.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** لەوانەیە بووترێ کوردان ئێستا هەندێ سیمای خۆیان لە دەستداوە و وەکو پێویست ناتوانن گوزارشت لە خۆیان بکەن و دووچاری

چەوسانەوەیەکی دژوار دەبنەوە. ئەمە بابەتێکی ترە، واتە لەئەنجامی زوڵم و چەوساندنەوەیەکی دژواردا بە رەوشێکی ناهەموار گەیشتوون. بەڵام کاتێک باس لە رەسەنایەتییان دەکرێت، ئەوا پاشماوەیەکی مێژوویی زۆر لە ئارادانە کە مایەی شانازی و سەربڵندیە.

دەکرێ بەشێوەیەکی تر و جیاواز پێناسەی کوردان بکرێ و چۆنێتی کاریگەربوونیان بە شارستانێتیە جیاوازەکان بخرێتە روو. لێرەدا سۆمەرییە کۆنەکان هەن و گواستنەوەی دەوڵەتە شارییە سەرەتاییەکان هەیە. هەروەها لەرۆژهەڵاتی پارس و دەوڵەتی میدیا هەن. وەك دەزانن زۆربەی ئەو پێکهاتانە بنچینەیەکی کوردیان هەیە و گشتیشیان هەندێك شوێنەواریان لەو خانە جوگرافیایە جێهێشتووە. هەروەها ئۆرارتۆییەکان، ئەسکیتییەکان (کاسیتییەکان) هەن کە لە باکوورەوە هاتوون و هەندێکیان لەسەر ئەو خاکە نیشتەجێ بوون. دوابەدوای ئەمەش حیسیەکان و گەلێك شارستانێتی دیکە کە لە نیمچە دوورگەی عەرەبییەوە پێیان هەڵگرتووە.

وەك دەزانرێت، فیرعەونییەکانی میسر بەم ناوچەیەش گەیشتوون. لێرە یەکەمین تابلۆ نووسراوە و، سەرەتاییترین پێوانە یاساییەکان (مافپەروەرییەکان) دارێژاوە و، سەرەتاییترین دەوڵەتە شارییە پۆلیسیەکان بەژێرخان و سەرخانەوە لێرە پێشکەتووە، تەنانەت یەکەمین ئیمپراتۆرییەتەکان لێرە دەرکەوتوون: ئیمپراتۆری بابلی، ئاشووری، میدی و پارسی، ئەمە لە کاتێکدا بووە کە هیچ ناوچەیەکی تری جیهان دەرکەوتنی ئیمپراتۆریەتییان بەخۆوە نەبینیوە. بەکورتی: لەم ناوچەیەدا، بۆیەکەم جار لەمێژوودا کۆمەڵگا بۆ سەردەمی شارستانیەت هەنگاوی هەڵێنا، پاشان بەکۆمەڵگای چینایەتی گەیشت و ژێرخان و سەرخانەکەی پێکهات. وەك هەر گەلێکی دیکەی ناوچەکە گەلی کوردیش ـ کە بەگەلێکی رەسەنی ناوچەکە دەژمێردرێت ـ هەر لەبەرەبەیانی ئەو ناوچەیەدا شارستانێتی ناسیوە و گەشەی پێداوە. لەوەش باشتر، کوردان لە ماڵیکردنی زۆربەی ئاژەڵەکاندا بەشداربوون، مێژوو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە یەکەم بوون لە ماڵیکردنی ئەسپ و چاندنی گەنم و جۆ و چەندین بەروبوومی دیکەی کشتوکاڵی کە خزمەتی مرۆڤایەتیان پێکردووە. واتە بەلانکەی چەندین پرەنسیپ و دۆزینەوە دادەنرێت.

مەبەستم لەو گێرانەوەیە ئەوەیە کە: رەچەڵەکی گەلی کورد و مێژووی مرۆڤایەتی، هەر لەسەردەمە دێرینەکانەوە ئاوێتەی یەکتری بوون و جودا نابنەوە و دروستبوونی ژێرخان و سەرخانی کۆمەڵگای بەخۆوە بینیوە، ئێمە لەبەردەم راستیەکداین بەلانکەی چەندین پێشکەوتن دادەنرێت، لە

ئابوورییـەوە دەسـت پێـدەکات و بـە یاسـاو سیاسـەت و کولتـوور تێدەپـەڕێت و تادەگاتە ئایین.

بـەڵام سـەبارەت بـە عیسـا، ئـەوا بەمێژوویـەکی نـوێ دادەنرێـت، ئـەوەی باسیشمان لێیەوە کرد زۆر کۆنترە. لەسـەردەمی عیساوە تـا ئـەمڕۆ دوو هـەزار ساڵ تێپـەڕیوە، ئەگـەر ئـەوەمان لەگـەڵ مێـژووی کـۆن بـەراورد کـرد، ئـەوا تـا ڕێژەیـەك وەك ماوەیـەکی کـورت دیـار دەبێـت. دەبـێ بـەمجۆرە مـەزنێتی ئـەو مێـژووە ببیـنین...! لـەلای ئێمـە وا بـاوە کـە دەسـتپێکردنی مێـژوو، واتـە ڕۆژمێری مێژوو، لەگەڵ لەدایکبوونی عیسا دەست پێدەکات. هەوڵیش دەدرێت باسکردنی ئەو مێژووە بە مێژووی یۆنان و ئیسلام و عوسمانیـەکان پاشـانیش بە مێژووی کۆمار دوایی پێبهێنرێت.

بـەڵام بەبۆچـوونی مـن لەبنەڕەتـدا بەمێـژووی بـەر لـەدایکبوونی عیسـا دەووتـرێـت مێـژوو...! بینـینی ئـەو ڕاسـتیە گرنگییـەکی زۆری هەیـە، ئەگـەر تێگەیشتن لە مێژووی گـەلانی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت و میزۆپۆتامیـا پێویست بێت، ئەوا قوڵبوونەوە لەسەر مێـژووی کـۆن خـۆی دەسـەپێنێ. لـەو قۆناخـەدا کوردان گەلێکی ڕەسەن و دێرین پێکدێنن و لـەم ڕووەوە هـیچ جیاوازییـەکیان لەگەڵ ئاشووری و ئەرمەن و گشت گەلانی تردا نییە.

لێرەدا دەمەوێ بەخێرایی باس لە دەرکەوتنی عیسا بکەم، چونکە ئاشووری و عەرەبەکان، تەنانەت جولەکەکانیش لەسەر ئەم خاکە ژیاون، وەك دەزانرێت عیسـا وێنەیەکـە لـە وێنـەکانی ڕاسـتی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت. بـەڕای مـن پێهـەڵگرتنی عیسا بەرەنگاربوونەوەیـەکی شـێلگیرانەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتە بـەڕووی کۆیلایـەتی ڕۆمـادا، هـەروەك چـۆن سـپارتاکۆس لەبەرامبـەر زۆرداری ڕۆما سەریهەڵدا، دەرکـەوتنی حـەزرەتی عیسـاش لـەو چوارچێوەیەدایە، بـەڵام بەشێوازێکی ئاشتیانە، ئەمەش ڕۆڵێکی بەرچاوی بـینی لەکـەوتنی ڕۆمـادا، زۆر گـرنگ و لـە شـوێنی خۆیدایـە سـەرلەنوێ لەسـەرهەڵدانی حـەزرەتی عیسـا بکۆڵدرێتەوە، کە بەپشت بەسـتن بەگـەلانی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت لەبەرامبـەر باڵادەستی گەورەترین چینی کۆمەڵایەتی لە مێژوودا بەرپای کرد.

ئـەمڕۆ ڕۆژئاواییـەکان، مەسـیحیەکانی ڕۆژئـاوا و نەتـەوە ڕۆژئاواییـەکان خـاوەن لـە حـەزرەتی عیسـا دەردەکـەون...! ڕۆژئاواییـەکان ڕاسـتیەکەیان شـێواندووە و بەشـێوەیەکی دروسـت هەڵسـوکەوتیان لەگەڵـدا نـەکردووە. لـە ڕاستیدا عیسا لە ئێمە و جوگرافیاکەمانـە و دیاردەیـەکی مـەزنی سـەرهەڵدانی گەلانمانـە، بەمـەش لـە ڕۆژئاواییـەکان زیـاتر لـە ئێمـە نـزیکترە. هـەوڵ دەدەم بەشێوەیەکی پەیوەستدار بە ئیسلامەوە ئەو مەسەلەیە تاوتوێ بکەم. بەمـەوە

دەمـەوێ بڵـێم: "یەکـەم زمـان کـە عیسـا قسـەی پێکردبێـت و لـە رێیـەوە پڕوپاگەندەی پێکردبێت زمانی ئاشوورییە".

**میهری بەللی:** زمانی دایکی ئارامیە و، زمـانێکی سـامیە و زۆر لـە سـریانی دەچێت، ئەو سەردەمە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست زۆر بڵاوببۆوە.

**عەبدوڵڵا نـۆچ ئـالان:** ئارامیـەکان، بـەڵێ.... وەڵامـی رۆمـا لەخاچدان بـوو. ئەوەی کە سەلمێنراوە ئەوەیـە یەکـەمین دەسـتەی فەلـەکان یەکـەمین خـانووی خۆیـان لـە ئەنتاکیـە و سـوریا ئـاواکردووە. مێـژوو جـەخت لەسـەر ئـەوەش دەکاتـەوە کـە سـەدان کەنیسـە (دێـر)یـان لـەژێر خـاك لـە ناوچـەی ئـەنادۆڵ بونیادنـاوە. دەبـێ چـۆن ئـەو مەسـەلەیە هەڵبسـەنگێنرێ...؟ بریتیبـوون لـە جووڵانەوەی پڕوپاگەندە کردن کە بۆ سەدان ساڵ بەردەوام بووە.

**میهری بەللی:** لەسەر بنەمای نهێنی بوون.

**عەبدوڵڵا نـۆچ ئـالان:** بریتیبـوون لـە گروپـی پڕوپاگەنـدەی نهێنی کـە تـا دواڕادە رێکوپێك بوون. ناوچەی ئـەنادۆڵ بەلانکـەیان دادەنرێـت، وەك ئـەوەی کەپەدۆکیا بەخۆیەوە بینیوە.

**میهـری بـەللی:** هـەروەها هەنـدێ شـاریش هەیـە کـە لـەژێر خاکـدا بونیادنراوە.

**عەبـدوڵڵا ئـۆچ ئـالان:** بـەڵێ... سـەرهەڵدانێکی گشـتگیری بـەڕووی رۆمـای مەزندا و بۆ ماوەی سەدان ساڵ لە کەپـەدۆکیا و ئـەفیس و ئـەنتاکیا بـەردەوام بووە، بەڵام پاشان لەناوچوو و لەنێو رۆمادا توایەوە.

لـە قۆناخـەکانی دوای ئەمـەدا ئـایینی مەسـیحی شـتێکی جیـاوازی لـێ دەرکەوت و بووە ئایینی دەسەڵاتداران، لێرەدا نامەوێ سەرنجی زیاتری لەسەر بدەم. ئەمەیە جێگەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ئایینەکانـدا. لـە قۆنـاخی دوای ئەمەشدا، قەڵەمبازی مەحەمەد هەیە کە گرێدانێکی پتەوی بەراسـتی گـەلانی ناوچەکەوە هەیە. بێ تێگەیشتن لەو پەیامـە تێگەیشـتن لـە راسـتی گـەلان زۆر دژوار دەبێت. تا رادەیـەکی زۆر بەشـداری لـە گەشـەپێدانی بازرگـانی هـەبووە. بەهۆی ئـەو وزە مەزنـەی هـەیبوو عەرەبـەکانی لـەو تەنگاوییـە دەرخسـت کـە تیایدا دەژیان. لەمەشدا روون دەبێتەوە کە مەحەمـەد (د.خ) زۆر بـەتوانا بـوو لە یەکخستنی پەیوەندی عەرەبەکان، لەگەڵ سەرنج راکێشی بازرگانی.

**میهـری بـەللی:** دینامیکییـەتی بازرگـانی بەشـداری کـرد لـە رزگـاربوون لەچوارچێوەی ناوچەگەری و کرانەوە بەڕووی جیهاندا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** زۆر بەتوانا بوو، ئەمەش بـە زمـانی قۆنـاخی ئـایینی و ئایدیۆلۆژی ئەنجام دەدات، بە سوورەتە قورئانییەکانی کە لەوپەڕی رەوانبێژی

و جوانکاری و پوختیدا بوو بەئەنجامی گەیاند. ئەمە هاوارێکی زۆر بەدەنگی ئایدیۆلۆژییە.

لەو قۆناخەدا بریتیە لە سەنتێزی گردبوونەوەی شارستانیەتییەکان و لەبنچینەی خۆیدا پشت بەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبەستێ. دوای موسا و عیسا (سڵاویان لێبێت) خۆی بە دوا پێغەمبەری نێرداو دەزانی و لەم رووەوە مافداریشە. کاتێك ووتی :"الیوم اكملت لكم دینكم ـ ئەمڕۆ ئایینەکەتانم کامڵکرد" مەبەستی ئەوەبوو بڵێت: هەرچییەك بەناوی ئایینەوە ووترابێت ئەمەیان لەهەموویان بەهێزتر و دوا وشەکانێتی. دوای ئەوە رۆڵ بۆ فەلسەفە و زانستە.

**میهری بەللی:** وەك بڵێی دەخوازێ بڵێت: دەبا لێرە خاڵێك دابنێین. بەتایبەتی لە سەردەمی عیسا بەدواوە پەیامبەرێکی نوێ دەرنەکەوتووە.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** تا دواڕادە ریالیست بوو، بەرەنگاری ئەو جەهالەتە بۆوە کە لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا زاڵبوو، ئەمەش پۆزەتیفانەیە و بەهەنگاوێکی پێشکەوتوو دادەنرێت. سەبارەت بە رەوشی ژنیش جێگەیەکی پێشکەوتووی پێداوە. رووبەڕووی ئایدیۆلۆژیا پەرشوبڵاوەکانی عەشیرەت و خێڵەکان بۆوە کە ئەو 360 بتانەی لە دەوروبەری کەعبەدا چەقێنرابوون نوێنەرایەتییان دەکرد.

پاشان گەیشتە چەمکی "الاله الواحد" کە گوزارشتێکی ئایدیۆلۆژیانەیە بۆ دەوڵەتی یەکگرتوو. بەچەندین سیفەت ستایشی کرد و بۆ پێکهاتەی کۆمەڵایەتی نوێ کردیە چوارچێوەیەکی ئایدیۆلۆژی، دواتر یاسای دارشت و دەوڵەت و یاساکانی پێشخست بەشێوەیەك لەو دەوڵەتە کۆیلەدارانە ئاست بەرزتربوو کە لە سەرەتای سەردەمی کۆیلایەتی ئاواکرابوون، هەروەها هەندێ بنەمای ئابووری دارشت بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە بازرگانییەوە هەیە.

لەو چواچێوەیەدا عەرەبەکان چاویان کرایەو و هۆشیار بوونەوە، لەسایەی مۆدێلی نوێی سیاسیدا بوونە هێزێکی سەربازی بەشان و شکۆ، لە کشان بۆ خاکی بیزەنتی و ساسانی و حەبەشییەکاندا سەرکەوتن. لە ئەنجامی ئەو قەڵەمبازە پێشکەوتووە، چەندین هەڵمەتی بەهێزیان بەدیهێنا و بونیادنانی ئیمپراتۆری ئیسلامی، لێکەوتەوە.

**میهری بەللی:** ئەوەی ئەو قۆناخەی بەرەو پێش برد هەمزە (خ.ر) بوو، کە بەکاری نێگەتیفانە دەستی پێکرد و زۆر بەخێرایی گەیشتە شێوازی کاری تێکۆشان.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** بەڵێ، تێگەیشتن لە تایبەتمەندی و سیما سەرەکییەکانی ئیمپراتۆری ئیسلامی سوودێکی مەزنی هەیە. بەر لە هەموو

شتێك فراوانخوازییەكەی لەسەر بنەمای بەرزكردنەوەی ئاستی میللەتێك نییە، بەڵكو بەرجەستەكردنی ئەو پرەنسیپ و پیوانانەیە كە بەسەر گشت گەل و میللەت و، تەنانەت بەسەر هەموو مرۆڤێكدا دەچەسپێ. دەكرێ هەمان شت سەبارەت بەعیسای مەسیحیش بووترێ. جووڵانەوەكەی بە جووڵانەوەی هەژاران دادەنرێت و بانگهێشتی بەكارهێنانی زمانە بەهێزەكەیان دەكات. بەڵام سەبارەت بە داوای مەحەمەد، ئارەزووی وەرچەرخان بۆ چینێكی باڵادەستی سەرووی بەسەردا زاڵە، ئەمەش مەسەلەیەكە خوازراوە و بەقۆناخێكی پێشكەوتوو دادەنرێت و بەرجەستەی بازرگانی و فیۆدالیزمی سەدەكانی ناوین دەكات كە دواتر لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هێزێكی زۆر و زەبەندی بەدەستهێنا، ئەمەش واتایەكی زۆر پێشكەوتووی وەرگرت. لەبەر ئەم هۆیە ئیسلام بە شۆڕش ناوزەد دەكەین، بەڕاستیش لەسەدە سەرەتاییەكانی قەڵەمبازەكەی خۆیدا زۆرشتی بەگشت گەلان بەخشی، هەر بۆ نمونە: عەرەبەكانی لەڕەوشی كۆچەرانە (          ) دەرخست و لەمیسر و وڵاتانی شام و بەغداد كردنی بەهێزێكی شارستانیەتی مەزن.

**میهری بەللی:** لە ئەندەلوسیش، لەماوەی پێنچ سەدەدا عەرەب مەشخەڵی شارستانییان هەڵگرت و بوونە میراتگری سەردەمی كۆن. لەسەردەمی رێنیسانس دا ئەم رۆڵە بۆ ئەوروپای رۆژئاوا دەگوازرێتەوە كە عەرەبەكان كولتووری خۆیان بۆ ئەوێ دەگوازنەوە، راستەوخۆ ئەو كولتوورە لەیۆنان یان رۆما بۆ ئەوێ نەگواستراوەتەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئیمپراتۆری تا ئەندەلوسیش درێژبۆوە و لەوێ بوژانەوەیەكی بەرزی ئەنجامدا كە تائێستاش لە ئەوروپا دەزرنگێتەوە. شارستانیەتی بەغداد تائێستاش وەك ئەفسانەیەك وێردی سەر زمانەكانە. ئەو راستییانە خۆی لەخۆیدا جەختكردنەوەیە لەسەر پێشكەوتنی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەلایەن ئیسلامەوە، بەتایبەتی تا هەزارەی یەكەمی دوای زایینی لەو ماوەیەدا گەلێك زانای ناوداری وەك (ابن سینا و ابن رشد....هتد) دەركەوتن كە تائێستاش رۆژئاوا بەشانازی و سەربڵندییەوە باسیان لێوە دەكات، هەروەها لە بەرزترین ئاستی پێشكەوتنی ناوچەكەدا چەندین مێژووناس و جوگرافیا ناس و ئەستێرە ناس دەركەوتن. واتە ئیسلام چ لەبواری سیاسی یان زانستییەوە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەیاندە ئاستێكی زۆر بەرز، لەوەش زیاتر لەو ناوچەیەدا و لەبواری هونەری سەربازیدا گەلێك كەسایەتی بلیمەت دەركەوتن، سەلاحەدینی ئەیوبی نمونەیەكە گوزارشت لە ئاست بەرزی سەربازی دەكات بەسەر رۆژئاواییەكاندا. بەكورتی ئیسلام تا هەزارەی یەكەمی دوای زایین و دوای ئەمەش بەچەندین سەدە و لەسەر ئاستی جیهاندا

گوزارشت لە شارستانیەتێکی بەهێز و پێشکەوتوو و ئاست بەرز دەکات. ئاست بەرزی بوارە ئابووری و سەربازی و کولتووری و سیاسی و یاساییەکانی گرتەوە، بەڕاستی ئەمەش واتای پادشایەتیەکی پرشنگدارە. بەو واتایە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەرلەنوێ بوژانەوەیەکی مەزنی بەدیهێنا، بەدەرکەوتنی ئیسلام دەست پێدەکات و تا سەدەی پازدە بەردەوام دەبێت. بەڵام قۆناخەکانی بەر لەوە، ئەوانیش یەك لە یەك ئاستیان بەرزترە، واتە تا سەدەی پازدە بڵندبوون بەردەوامە. هەرەمەکانی میسر، باخچە هەڵواسراوەکانی بابل و بورجی بابل باشترین گەواهی ئەو راستییەن، شارستانیەتی میزۆپۆتامیا ئێستاشی لەگەڵدا بێ ئەقڵ سەرسام دەکات. ئەوەی ئەمەوێ بیڵێم ئەوەیە: ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەر لەبەرەبەیانی مێژووەوە تا سەدەی پازدە لانکەی شارستانیەتی مرۆڤایەتی بووە و بەدرێژایی چەندین سەدە گوزارشتی لەئاست بەرزی کردووە. بەو واتایە، هەموو ئەو گەلانە دێرینترین گەلانی جیهانن.

بەتایبەت لەو خاڵەدا، لە ناوەڕاستی ئاسیاوە فراوانخوازی تورکەکان دەست پێدەکات. سەرەتا دەمەوێ ئاماژە بەوە بکەم کە لە ناوچەکەدا نەژادێکی پاك لەئارادا نییە. باوەڕ ناکەم نەژادی تورکەکان کە لەناوەڕاستی ئاسیاوە هاتوون نەژادێکی پاك بێت. باوەڕی هەرە زێدە ئەوەیە کە نەژادەکەیان ئاوێتەی نەژادە چینی و مەنگۆلییەکان و چەندین گەلی دیکە بووبێ. واتە ئەوانیش نەژاد پاك نین، بەڵکو ئاوێتەدارە و بەکۆچەری و سوارچاکی دەناسرێن، ئیتر نەیانتوانیوە لە ناوەڕاستی ئاسیا بمێننەوە، بەتایبەتی بەهاتنی هەزارەی یەکەمی دوای زایین و لە ئەنجامی قات و قڕی (گرانی) و زۆر بوونی ژمارەی دانیشتوانەوە دووچاری کۆچبەرییەکی ناچاری بوون. لەدوای زایین و کەمێك دوای ئەوەش لەتوانای ئەو میللەتانە هەبوو لەوێ بەردەوامی بەگوزەرانی خۆیان بدەن، ئەگەرچی ئەو قۆناخە هەندێك کۆچبەری بەرەو سنووری هیندستان و بەرزاییەکانی روسیا و ئێرانی بەخۆوە بینی، بەڵام ئەمە سنووردار بوو و کەوتبووە ژێر کاریگەری ئیمپراتۆرییەتەکانی چین و هیندستان و ئێران، بەهەمان شێوە عەرەبەکانی بیابان نمونەی میللەتە بیابانییەکانی ئاسیای ناوەڕاستن.

بەهاتنی سەردەمی گۆك تورکلەر وەك چۆن لە میللەتان و گەلانی تردا دەبینرێت، پێچدانەوەیەك لە بەرەو یەکگرتنی عەشیرەتەکان دەبینین. ئەگەر بڕوانینە ئەوەی سەبارەت بە ئۆکلجین و نەوەکانی ووتراوە و دەووترێت دەبینین بەشێوەیەکی تایبەت بەرەو کۆنفیدڕاڵی عەشیرەتەکان وەردەچەرخێن. واتە تورکەکان لەسەدەی حەوت و هەشتەمی زایینی دا کۆمەڵگای سەرەتایی دەربازدەکەن و بەرەو سیستەمی عەشیرەتگەری و

یەکێتییەکان هەنگاو دەنێن، واتە بەرەو کۆمەڵگای چینایەتی. بەتایبەت لەو خاڵەدا ـ وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد ــ قات و قڕی و زۆربوونی دانیشتوان دەستپێدەکات، بەڵام بەڕای من ئارەزووی دامەزراندنی دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆیان هۆکاری هەرە سەرەکییە، بەتایبەت دوای ئەوەی چەندین کۆڵەکە و هێزیان بۆ پێك هێنا بەڕادەیەك ئاسیای ناوەڕاست بۆیان بەرتەسك دەبێت. وەك لەلایان باوبووە، کۆچبەری مەزنیان بۆ قوڵایی ئێران ئەنجام داوە.

ئایا دەزانن دەبێ چۆن سروشتی ئەو کۆچبەریانە دەستنیشان بکەین...؟ لە راستیدا ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەك چۆن بەوڵاتی حیکایەت و چیرۆك و "چیرۆکەکانی هەزار و یەك شەو" دادەنرێت و ببوە جێگای چاو تێبڕینی خاچپەرستەکان، بەهەمان شێوە بەجێگای چاو تێبڕینی تورکەکانی ئاسیای ناوەڕاست دادەنرێت. کاتێك ناوی ئێران و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکەوێتە نێو باسەوە، دەوڵەمەندی و ناوچەی چیرۆك و هەقایەتەکان و دەنگە سەداییەکەی بەهزری مرۆڤدا دێت. هەربۆیە شوێنێکی سەرنج راکێشە و کەس لەبەرامبەریدا خۆی ناگرێت، ئەگەر گشت ئەو تایبەتمەندی و زۆری و زەحمەتی و پێداویستییە جوگرافی و دیموگرافییەکانی تورکەکان لەبەرچاو بگرین، روون دەبێتەوە کە بۆچی کۆچبەرییەکانی دواییان چڕوپڕ دەبێت، بەڕاستی ئەوەی روویدا بەمجۆرە بوو، کاتێك شەپۆلە بەدوایەکدا هاتووەکانی کۆچبەری دەستپێکرد. ئەمە لەو کاتەدا بوو کە لە هەزارەی دوای زایین تا قووڵایی ئێران خزان و لەساڵی 1040ی زایینیدا شەڕێکی خوێناوی لە "دەندنکان" روویدا. ئەو شەڕە سەرەتای کۆتایی دەسەڵاتی خانەدانە ئێرانییەکانە، کە خانەدانی غەزنەوی و سامانییەکان لە پێشەوەی ئەو خانەدانانەدا بوون و تورکەکان تیایدا بەشدارییەکی کاریگەرانەیان هەبوو و، بەقۆناخێکی گواستنەوە دەژمێردرێت. پاشان سەلجوقییەکان دێن کە رەچەڵەکیان بۆ خانەدانی ئۆغۆزییەکانی تورك دەگەڕێتەوە، ئەمانە بەسەر ئێرانییەکاندا سەردەکەون و دەوڵەتی گەورەی سەلجوقی دادەمەزرێنن کە دەبێتە بنچینەیەك بۆ دەوڵەتە تورکییەکانی دوای خۆی.

بەڕاستیش مایەی سەرسوورمانە...! کاتێك یەکێك لە سوڵتانەکانی سەلجوقییەکان ــ پێم وایە سوڵتان سەلجوق خۆیەتی ــ دەگاتە سنووری کوردستان، هەڵسەنگاندنێك دەکات کە دەستەواژەی "ویلایەتی کوردستان"ی بەکارهێناوە. لە راستیدا ئەو سوڵتانە پێشتر شکستی بە ئێرانییەکان هێنابوو، بەڵام لەو باوەڕییەدابوو کە شکست پێهێنانی خێڵ و عەشیرەتە کوردییەکان مەسەلەیەکی هەروا ئاسان نییە، بۆیە لەگەڵیاندا لەبری پەنابردنە بەر لێدانی کوشندە رێگای تەبایی و هاوپەیمانێتی دەگرێتەبەر. هیوادارم مێژوو ناسەکان

لە راستی ئەو مەسەلەیە بەشێوەیەکی بەرفراوان بکۆڵنەوە. ئەوەی لەم رووەوە ئەنجامم داوە تەنیا دەستنیشان کردنێکی دەستپێکە. وادیارە ئەو سوڵتانە باش دەرکی بەوە کردووە کە کەوتنە نێو ململانێ لەگەڵ کوردان رێی کەوتنە نێو رۆژهەلاتی ناوەراستی لێدەگرێت. هەروەها تەواو گەیشتبووە ئەو باوەرییەی ململانێیەکی بەمجۆرە دەرگاکانی ئەنادۆڵ و ئێران و ئێراق لەبەردەم تورکەکان دادەخات. بۆیە دەڵێت:"پێویستە لەسەرمان بەدوای ئەو رێگەیەدا بگەرێین کە گەرەنتی بەتەبایی و لەیەك تێگەیشتن لەگەڵ کوردان دەدات". ئەمە دەست نیشان کردنێکی سیاسی راست و گرنگە. ئەگەر لەمێژووی سەلجوقییەکان بکۆڵنەوە دەبینن کە میرنشینە تورك و کوردەکان تا دوارادە تێکەلاو و ئاوێتە بوون. لێرەدا دەتوانم چەندین نمونە بهێنمەوە و کێ بخوازێ دەتوانێ ئەو مەسەلەیە بە روونی بخاتە روو. زۆر لە کوردەکان قەرە قۆیۆنلۆلەر، ئاق قۆیۆنلۆلەر و ئەرتیق و گوللۆلەری یان بەبەگی خۆیان داناوە، ئەمە لەکاتێکدا هەندێ لە بەگە کوردەکان بەبەگی خێڵە تورکەکان دادەنرێن. تێکەلاو بوون تا ئەو رادەیە چروپرە و تەبایی بەسەریدا زاڵە و زۆرکەم ململانێی تێکەوتووە. ئەمە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە.

هیوادارم مێژوو نووسەکان بەویژدانەوە هەڵسوکەوت بکەن، ئەو کاتە شێوازی پەیوەندی کورد ـ تورك تا رۆژی ئەمرۆ ئاشکرا دەبێت و دەکرێ گەلێك وانەی لێ دەربخرێت. ئەو تورکانەی ناوی مندالەکانیان کردۆتە تۆغرۆل تورکەش لە هەڵەیەکی مەزن دان و راستی مێژووییان پشتگوێ خستووە، ئەمەش هەڵەیەکی تاڵ و کوشندەیە، هیوادارم بەشێوەیەکی ریالیستیانە ئەوە ببینن کە تۆغرۆل و سەلجوق و ئەلپ ئەسلان چییان لەگەڵ کوردان کردووە و لەشێوازی پەیوەندیەکانی کورد ـ تورك کە ئەو کاتە زاڵبوو وانەی پێویست بۆ رۆژی ئەمرۆ وەربگرن.

کەواتە ئەمە شێوازی پەیوەندی و هەڵوێستی سەلجوقە کاتێك دەگاتە سنووری کوردستان. سەبارەت بە عەرەبیش هەمان رەوش لە ئارادایە، کاتێك تورکەکان دەگەنە کۆشکەکانی عەرەب و تیایدا سیاسەت و هونەری سەربازی فێردەبن. لەسەرەتادا لەبەغداد خزمەتی عەباسییەکان دەکەن، پاشان دەست بەسەر سیستەمی دەوڵەتدا دەگرن و چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی خۆیان فراوان دەکەن، لەگەڵ کوردانیشدا هەمان شت دەکەن و لەسەردەمی ئەلپ ئەسلاندا تا مەلازگرت هەڵدەکشێن. مێژوو راشکاوانە دەبینێ کە لەشکرەکانی ئەلپ ئەسلان زۆربەیان لە کوردان پێکهاتبوون، تەنانەت هەندێ لەمێژوو نووسەکان ناوی یەکە بەیەکەی عەشیرەتەکان دەخەنە روو. ژمارەی کوردان لەبیست هەزار کەمتر نەبووە، ئەمە سەرەرای ئەوەی کە شەرەکان لەسەرخاکی

کوردستاندا روویانداوە و لەلایەن ژمارەیەکی زۆری بەگە کوردەکانەوە پشتگیری مەعنەویان لێکراوە. ئەگەر شەڕ لەسەر خاکی کوردستان رووی نەدابایە و ئەو پشتگیرییە مەعنەوییەی کوردە موسڵمانەکان نەبوایە چۆن ئەڵپ ئەسلان و لەشکرەکەی دەیانتوانی بەرگەبگرن؟.

**میهری بەللی:** واتە ئەگەر هاوپەیمانێتی کورد ـ تورك نەبوایە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** من دێمە سەر ئەو خاڵەش، کە ئەو مەسەلەیە وەك راستییەکی مێژوویی شرۆڤە دەکەم نەك بۆ گاڵتە یاخود وەك پڕوپاگەندەیەکی PKK، تکایە باهەموو کەسێك بەم شێوەیە لێی تێبگات. دەبا زانا و مێژوونووسەکان بفەرموون لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو مەسەلەیە بکەن و دەستنیشانی ئەوە بکەن کە ژمارەی کوردەکان لە ریزەکانی لەشکرەکەی ئەڵپ ئەسلان چەند بوون؟ ئایا دەیتوانی لەو شەڕەدا سەربکەوێ کە لەسەر ئەو خاکەی لەهەموو لایەکەوە بەعەشیرەتە کوردییەکان تەنراوە؟ باش و وریابن، ژمارەی سوپای (دێوژنی) رۆمانی دووسەد هەزار سەربازبوو، ئەمە لەکاتێکدا سوپاکەی ئەڵپ ئەسلان لە پەنجا هەزار سەرباز تێنەدەپەڕی. ئەگەر پشتگیری و هاوکاری کوردان نەبووایە نەیدەتوانی یەك هەنگاو بەرەو پێشەوە بچێت و، زوو لەناو دەچوو، تورکەکان نەیاندەتوانی یەك پەنجەش لە سنووری ئێران بپەڕنەوە. ئەگەر توانیان تا مەلازگرت بچن ئەوە بە پشتیوانی کوردان و هاوپەیمانێتییەکەیان بوو. ئەمەش راستییەکە روون و ئاشکرایە و ناشاردرێتەوە! دیسان جەخت لەسەر تێگەیشتن لەو راستییە دەکەمەوە.

لەگەڵ هاتنی سەردەمی سەلجوقییەکانی ئەنادۆڵ، بەدەربڕینێکی دیکە سەردەمی کرانەوەی دەرگاکانی ئەنادۆڵ لەبەردەم تورکەکان، دەکرێ بووترێ کە کوردان ئەو دەرگایانەیان بۆ تورکەکان خستە سەرپشت. لە رووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و سەربازییەوە کرانەوەیان ئەنجامدا. لەسەر ئێوەی رووناکبیری تورك پێویستە لەو مێژووە بکۆڵنەوە، بۆ ئەوەی خۆتان ئەو راستییە ببینن کە ئەگەر پشتیوانی کورددان نەبوایە نەیاندەتوانی یەك هەنگاو لە سنووری ئەنادۆڵ بپەڕنەوە. ئەوەی ئەنجامم داوە بەهێڵێکی پان پێناسەیەکی گشتییە.

**میهری بەللی:** ئەو رووناکبیرە تورك و کوردانەی گرنگی بە مێژوو دەدەن زۆربەیان خاوەن مەیلی نەتەوەپەرستی سەرەتایین، وەك بڵێی ئامانج لە لێتوێژینەوەی مێژوو دروستکردنی کەلێنە لەنێوان گەلاندا. هەربۆیە بۆ خزمەتکردنی ئەو ئامانجە سوورن لەسەر شێواندنی راستییە مێژووییەکان. کەچی هەڵوێستی راست و زانستییانە ئەوەیە لەسەر بنەمای یەکێتی ئازاد بۆ لەیەك نزیکخستنەوەی گەلان بێت. ئەو هەڵوێستە لەنێوان خێڵ و عەشیرەتە تورکەکان لەسەرەتای هاتنیان بۆ ئەنادۆڵ باو بوو. لەوانەیە هەندێ

دەرهاویشتە (        ) هەبێت، بەڵام چوارچێوەی گشتی بەو شێوەیەیە کە باسمان لێیەوە کرد. ئێمە لەسەرمانە و دەبێ ئاماژە بۆ ئەو راستییە بکەین. پڕوپاگەندەی فەرمی بە جوداخواز تاوانبارت دەکات، ئەمە لەکاتێکدا تۆ بەدوای کۆڵەکە و دینگە مێژووییەکانی یەکێتی هەردوو گەلدا دەگەڕێیت. داخوا ئەمە مەسەلەیەکی سەرسوورهێنەر نییە؟!

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** دوای ئەمە وەك دەزانن شەپۆلێکی مەزنی کۆچبەری قەومە تورکییەکان بۆ ئەنادۆڵ دەستپێدەکات. ئەم شێوازەی پەیوەندی نێوان هەردوو گەل کەم تا زۆر تا دوای شەڕیش بەردەوام دەبێت. لەوانەیە پرس بکرێ: داخوا هیچ ململانێیەکی تێنەکەوتووە؟ بەڵێ...! بەڵام هاوپەیمانێتی باڵادەست بوو، ئەوەی خوازراو و مەبەستی ئێمەش ئەوەیە. سەرلەنوێ دووپاتی دەکەمەوە، گەلێك میرنشین هەن کە بەگە تورکەکان لە ماردین و دیاربەکر و ئەخلات و ئەرزەرۆم بونیادیان ناوە، ئەوەی جێی سەرنجە سەرجەم لەو میرنشینانەدا کورد ـ تورك ئاوێتەی یەکتری بوون و چەندین خێڵی تورکی لەبۆتەی کورداندا تواونەتەوە، وەك خێڵی قەرە کچلیلەر کە لە دەوروبەری قەراج داغ دەژین و لەمن باشتر بە کوردی قسەدەکەن، تەنانەت یەك وشەی زمانی تورکیش نازانن، ئەمە لە کاتێکدا لە رەچەڵەکدا لەخێڵی تورکمانەکانن، هەروەها چەندین خێڵی تری هاوشێوە هەن. ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە شێوازی پەیوەندی باو تا رادەی توانەوەیان لە بۆتەی یەکتریدا پەسند کردووە. کەچی ئەوەی لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا باوە لەوکاتەدا نەبووە، وەك تورکەکان دەستی خۆیان لەکوردەکاندا سەربەست بکەن و بە مەترسی ژمارە یەکیان دابنێن. بۆ ئێمە مێژووی رابردوو باشتربوو، بەڵام مێژووی ئێستا مێژوویەکی شۆڤێنیستانەیە و بێ سنوور لەنێو فاشیزمدا خنکاوە.

دوای سەرنجدان لەو خاڵە، دوای ئەوە تورکەکان چییان کرد؟ دوای ئەوەی بەهێزی ئیسلام و ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت و هێزە سەربازییەکەی خۆیان تۆکمە کرد هەڵمەتێکی بەرفراوانیان بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەنجامدا و سەرجەم گەلانی ئەو ناوچەیەیان خستە ژێر رکێفی فەرماندە سەربازییەکانیان. هەروەك دەزانین لە ئەنادۆڵدا دەوڵەتی سەلجوقییان دامەزراند کە لەدوای جەنگی خاچپەرستەکانەوە بۆ چەند سەدەیەك بەردەوام بوو. بەرچاوترین تایبەتمەندی "قلج ئەسلان" بەرپاکردنی شەڕێکی دژواربوو لەدژی خاچپەرستەکان و رێگای بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقی کردەوە. دوای ئەوەش شکستییان بە یەك بەیەکی میرنشینە بێزەنتییەکان هێنا و گەیشتنە دەروازەکانی ئەستەمبوڵ و، لەسەر کەلاوەکانی دەوڵەتی عوسمانییان دامەزراند. لەسەردەمی ئیمپراتۆرییەتی سەلجوقییدا کە تا چەند سەدەیەك

بـەردەوام بـوو، تورکـەکان لـە رەوشـی گـەلێکی کۆچـبەرەوە دەرکـەوتن و لـە ئەنادۆڵ نیشتەجێ بوون و کۆڵەکەکانی بەگـەلبوون تیایانـدا پێـك هـات، بـەڵام تاکە گـەلی ئـەنادۆڵ نـەبوون بـەڵکو ئەرمـەن و پۆنتـۆس و رۆم و تورکمـانیش هەبوون.

لێرەدا دەبێ ئاماژە بەتایبەتمەندییەکی بەرچاوی ئەو سەلجوقییانە بکـەین کـە دەوڵـەتی خۆیـان ئـاواکرد، ئەوانـە زۆربـەیان لەتوێـژی خانـەدانان (ئاریسـتۆکرات) و توێـژی سـەرەوەی بەگـەکان بـوون. بـەڵام گـەل، واتـە چینـە ژێردەستەکان لەچیاکانی دەریای سپی و چیاکانی تۆرۆسـدا نیشـتەجێ بـوون، بەمەش تەواو پچڕابوون لەچینی دەسەڵاتدار و کولتوورێکی تایبـەت بـەخۆیان ئافرانـد و لەسایەی ئـەوەدا ژیانیـان بەسـەر دەبـرد، ئەوانـە پێیـان دەگوترێـت تورکمان. بەڕای من ئەوەی دەبێ ناوی گەلی تورکی لێبنرێت ئەو تورکمانانـەن کـە بـەو تایبەتمەندییانـە دەناسـرێن: کاتێـك وەرچـەخانی چـینایەتی دەسـتیپێکرد و چـینە دەسـەڵاتدارەکانی تـورك و ئـەو میرنشـینانەی لەسـەر رێبازیـان بەرێوەچـوون و خـودی سـەلجوقییەکانیش لـەژێر نـاوی دەوڵـەتی عوسمـانی خۆیـان رێکخسـت، شانبەشـانی چەوسـاندنەوەیەکی زۆر دژوار جیاوازیش دەستی پێکرد. ئەگەر باش سـەرنج بـدەین دەبیـنین میرنشـینەکانی قارما لەژێر داپلۆسینێکی توندوتیژدا لەناوچو و، لـەژێر نـاوی دژایـەتیکردنی عەلەوێتی شەرێکی درندانەیان دژی تورکمانەکان راگەیاند ـ جێی باسە چینی دەسـەڵاتدار بەمەزهـەب سـونین، بـەڵام زۆری تورکمـان عەلـەوی مەزهـەبن و لەناوچـە شـاخاوییەکاندا نیشـتەجێ بـوون ـــ شـەرێکی زۆر خوێنـاوی و وێرانکاربوو. ئەوەی سەرنج راکێشە، لەو ماوەیـەدا سـوڵتانەکان لەگـەڵ کـوردان لەشـەڕدا نـەبوون، بـەڵام لـەدژی چینی چەوسـاوەی تـورك واتـە تورکمانـەکان شەرێکی وێرانکاریان بەرپاکردووە، کە لـە کرۆکـی خۆیـدا شـەرێکی چینایەتی دژوارە، ئەمـە تایبەتمەنـدی هـەرە دیـاری ئـەو قۆناخـەی مێـژووە، بەمـەش تورکمان توێژێکی جیاوازن، گەلی تورك خۆیانن.

دوای ئەو گێڕانەوە کورتە، دەبێ ئاماژە بـەوەبکرێ کـە زمـانی فـەرمی ئـەو سـەلجوقییانەی لـە قۆنیـا و دەوروبەرەکەیـدا جێگیربـوون زمـانی فارسـی بـوو. "مەولانا"ش مەسنەوییەکەی بەزمانی فارسـی نووسـیوە و بـەپاراوی بەفارسـی قسـەی کـردووە، بـەڵام زمـانی عوسمانییـەکانی ئەسـتەمبوڵ زاراوەی عوسمـانی بـوو و پەیوەندییـەکی نزیکـی بـەزمانی تورکییـەوە نییـە. هـەروەها هـیچ پەیوەندییەکی بە قەرەجە ئۆغلان و یونس ئیمراوە نییە.

**میهری بەللی:** ئەمە راستە. زمانی تورکی بەزمانی تورکـە ئەنادۆڵییـە بـێ کولتوورەکان دادەنرێت و وشەی "تورك" بۆ سووکایەتی کردن بەکار دەهات.

**عەبدوڵڵ نۆچ نالان:** یونس ئیمرا و قەرەجە ئۆغلان قسە بێژ و شاعیری گەل بوون، بەڵام ئەوانەی تر شاعیری دەربار (خان) و کۆشك بوون. دەبێ تێگەیشتن و داڤورتاندنی ئەو دیاردانە لەسەر ئەو بنەمایە بێت کە دەرئەنجامێکی شەڕی چینایەتیە. هیوادارم ئەوانەی سەرقاڵی لێتوێژینەوەی مێژوون لەجاران باشتر هەڵسەنگاندنی لەسەر بکەن.

لەوانەیە بپرسن: دواتر رەوشی کورد و تورکەکان چی دەبێت؟ چ شێوازێکی پەیوەندی لەنێوانیاندا بالادەست دەبێت؟ یەکەم بەردی بناخەی کێشەکە گەیشتنی سەلجوقییەکانە بۆ سنووری کوردستان و داخزینییانە بۆ قووڵاییەکەی لەسەر بنەمای تەبایی و دۆستایەتی، ئەو تەباییە و شەڕی مەلازگرت و داخزین بۆ قووڵایی ئەنادۆڵ بەپشتیوانی کوردان ئەنجام دراوە، ئەو پشتیوانییە لەگەڵ جودایی چینایەتی و دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقی و تا دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەردەوام بوو. لێرەدا نامەوێ شرۆڤەی ئەو قۆناخە بکەم کە تا سەردەمی مەحەمەد ئەلفاتح بەردەوام دەبێت. بەکورتی دەوڵەتی سەلجوقی ئیمپراتۆریەتێك بوو لە ئەنادۆڵ سەریهەڵدا بەڵام لەژێر کاریگەری فارسەکاندا بوو. وەکو پێشتریش ئاماژەم پێکرد زمان و کولتوورەکەی بەتەواوی فارسییە. ئەمەش ئاماژەیە بۆ کاریگەری مەزن و توانەوە لەبۆتەی ئێراندا لە سەردەمی دروستبوونی دەوڵەتی مەزنی سەلجوقییەکان. بەڵام رەوشی میرنشینە عوسمانییەکان تەواو جیاوازە. وەك دەزانرێ، ئەو دەوڵەتە لە شوێنێکدا نەشونمای کرد کە لەژێر کاریگەری بێزەنتییەکاندا بوو، ئەو کاریگەرییەشی زێدەتر دەبێت کە لەسەرەتای تەمەنییدا بەرەو "تراکیای رۆژئاوا" هەڵدەکشێت. وەکو دیار دەبێت دواتر ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەئەستەمبوڵ جێگیر دەبێت و فۆرمیلەی کۆتاییش لە تراکیادا وەردەگرێت. شاری بۆرسە یەکەم پایتەختی بوو، پاشان شاری ئەدیرنە دەبێتە پایتەخت. پاشان لەناوچەی بەلکاندا فراوان دەبێت و ئیدی شکستی میرنشینەکانی ئەنادۆڵ دەستپێدەکات.

عوسمان بەگ لە شکست پێهێنانی میرنشینەکانی ئەنادۆڵ سەرکەوتنی بەدەست هێنا، کە بەڕای ئێمە شەڕێکی چینایەتی نییە. ئیتر تورکمان ناچار دەبن خۆیان لە چیاکاندا حەشار بدەن، بەڵام میرنشینە بچووکەکانی تر دەکەونە ژێر رکێفی دەوڵەتی عوسمانی و لەسەر بنەمای شەڕێکی چینایەتی زۆر توندوتیژ لەنێو بۆتەیدا دەتوێنەوە. لێرەدا دەکرێ شێخ بەدرەدین لەهەمان چوارچێوەدا باس بکەین. چونکە سەرهەڵدانەکەی بە بەرەنگاربوونەوەیەکی توند دادەنرێت لەبەرامبەر ئەو وەرچەرخانە بەرفراوانە چینایەتیە. ئەگەرچی ئەو سەرهەڵدانە لەژێرناوی ئایین و

مەزهەبدا دەرکەوت، بەڵام لەڕاستیدا ئەو ساڵانە لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەساڵانی جودایی چینایەتی توندوتیژ دادەنرێت. ئەو جودابوونەوەیە یاخود ریزبەندیەی لە کرۆکی خۆیدا لەدژی گەلانە، واتە دواکەوتوویی بەسەریاندا دەسەپێنێ ـ لەنێو ئەو گەلانەشدا گەلی تورکمان ـ ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە هەوڵدان بوو بۆ پاکتاوکردنی میرنشینە بچووکەکان، لەسەر ئەو بنچینەیە شێخ بەدرەدین لەلایەن توێژە رەنجدەرەکان و شێخەکانی نێو دەوڵەتی عوسمانییەوە پشتیوانی لێدەکرێت. بەرچاوترین شێخیش موسا چەلەبییە. یەکەمیان (شێخ بەدرەدین) خاوەنی مەیلێکی تورکانەیە، بەڵام شێخی دووەم (شێخ موسا چەلەبی) لەژێر کاریگەری ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتیدا بوو، بەدەربڕینێکی تر شێخ بەدرەدین مەیلێکی ئەنادۆڵییانەی هەبوو، بەگەلان گاریگەر ببوو بەتایبەت تورکمانەکان، سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا و دووچاری شکستێکی ناوخۆیی دەبێت.

لەقۆناخێکی بەمجۆرەدا مەحەمەد ئەلفاتح دەردەکەوێ کە تەواو لەژێر کاریگەری رۆژئاواییەکاندایە. من مەحەمەد ئەلفاتح بە ئیمپراتۆرێك دادەنێم، ئەو یەکەم کەس بوو کە بنچینەکانی ئیمپراتۆرییەتی داسەپاند. وا ڕاسترە باب و باپیرانی تەنیا بەبەگ و میر دابنێین، وەها دادەنێن کە لە بەگزادەکان بووبێت، چونکە بەسەر میرەکانی تردا زاڵ نەببون ئەگەرچی هەندێکیان تا پلەی میرێتی چووبن، بەڵام مەحەمەد ئەلفاتح بە سەرەتای سەردەمی ئیمپراتۆرییەت دادەنرێت تەواو وەك ئیمپراتۆرییەتی رۆما، ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی، ئیمپراتۆرییەتی ساسانی، ئیمپراتۆرییەتی عەباسی، لەگەڵ مەحەمەد ئەلفاتح دا ئیمپراتۆرییەتی بەرفراوانی عوسمانی ئیسلامی دەستپێدەکات، بەڵام داخوازییە بیزەنتییەکانی لە رۆژهەڵاتییەکەی زێدە ترە، لەوەش زیاتر مەسیحییەکان بانگهێشتی دەکەن و پێی دەڵێن: "وەرە سەر مەسیحیەت بە ئیمپراتۆرت دادەنێین و مۆڵکەکەت تا رۆما درێژ دەبێتەوە". زۆر دوو دڵ دەبێت لە پەسندکردن یان رەتکردنەوی ئەو مەسەلەیە، ئەو ئیمپراتۆرێکی جیاوازە و تیۆرە ئایینەکان نایگرنە خۆی، سەرقاڵی شیعرە و غەرقی ئارەق خواردنەوەیە.

**میهری بەللی:** ئەمە تەواو زانراوە.

**عەبدوڵڵا نۆج تالان:** ژیانی ناو کۆشکەکانی دەزانرێت نامەوێ شرۆڤەی بکەم، بەیەك وتە ژیانێکی ئەوروپایی بوو. مەحەمەد ئەلفاتح کەسێتیەکی دوو دڵ بوو، هەمیشە لەناخیدا لەنێو ململانێ دابوو (ئاخۆ خۆم بە موسڵمان دابنێم یان مەسیحی، رۆژهەڵاتی یاخود رۆژئاوایی؟) بە پێویستی دەبینم لەم گۆشەیەشەوە گفتوگۆی لەسەر بکرێت.

**میهری بەللی:** ئەو دەستڕۆییەی بە بەتریکی ئەستەمبوڵی داوە ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی پێی نەدەدا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ... وا مەزەندە دەکەم خەونی بەوە دەبینی ببێتە ئیمپراتۆرێکی ئەرتۆدۆکسی. ماوەی دوای سەردەمی ئەلفاتح زۆر گرنگە. لەو قۆناخەدا ململانێیەکی توندوتیژ لەنێوان بایەزید و سوڵتان جام روودەدات. وەك دەزانرێت سوڵتان جام تا ڤاتیکان و رۆما باڵادەست دەبێت و، لایەنگری رۆژئاوایە، کەچی بایەزید لە پەلهاوێشتنەکانی خۆیدا تا رۆژهەڵاتی ئێران دەچێت و، مەیلێکی رۆژهەڵاتییانەی هەیە. لێرەدا ململانێیەکی توندوتیژ لەنێوانیاندا سەرهەڵدەدا، ئەمەش بەو واتایە دێت کە ململانێ لەسەر "ئایا ئیمپراتۆرییەت مۆرکێکی رۆژهەڵاتی لەسەر بێت یاخود رۆژئاوایی؟" دەبێت و، وەك دەزانرێت یاووز (سوڵتان سەلیم یاووز) کوڕی بایەزید، دەست لەمەسەلەکە وەردەدات و کۆتایی بەو ململانێیە دێنێت و بەشێوەیەکی روون ئاراستەکەی دیاردەکات.

**میهری بەللی:** رووەو رۆژهەڵات ئاراستە وەردەگرێت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ.... چونکە رۆژئاوا مەترسی تواندنەوەی تێدا بوو، واتە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ببێتە ئیمپراتۆرییەتێکی نوێی بێزەنتی یاخود راستر بڵێین ببێتە ئیمپراتۆرییەتێکی مەسیحی. مەیلی سوونیگەرانەی توندی رۆڵێکی گرنگی بینی لە کۆتایی هێنان بەم مەسەلەیە. دوای ئەوەی لە بوونی بەئیمپراتۆرێکی رۆژهەڵاتی یەکلابوونەوەیەك دەکات، ئەو کاتە لەناوچەکەدا دوو دەوڵەتی ناوەندی بەهێز هەبوون، یەکەمیان: دەوڵەتی فاتمی بوو لە میسر، راستە لەبنەڕەتدا تورك بوون بەڵام ببوونە مەمالیکی عەرەب. دووەمیان: دەوڵەتی سەفەوی ئێرانی بوو کە دەکەوتە رۆژهەڵاتییەوە. هەردوو دەوڵەت بەهێز بوون، یەکەمیان لە باشوورەوە تا چیاکانی تۆرۆس درێژ ببۆوە و سنووری دەسەڵاتی سوڵتانەکانی میسر تا چقورئۆڤا، چیاکانی تۆرۆس، باشووری چیاکانی تۆرۆس دەچوو. کەچی مولکی سەفەوییەکان تا رووباری فورات درێژ ببۆوە، هەندێ جاریش تا ئەنادۆڵی ناوەوە دەچوو، پەیوەندیەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ تورکمانەکان هەبوو، کە ئەوانیش عەلەوی واتە شیعەبوون. بەواتایەك لە واتاکان سەفەوییەکان وەك کۆمۆنیستەکانی ئەوکاتە بوون، بەشێوەیەکی زۆر سەرکەوتووانە توانییان تورکمانەکان رێك بخەن.

**میهری بەللی:** مەزهەبی شیعە لە ئێراندا ئاینی دەوڵەت بوو شانبەشانی سیستەمی چەوسێنەر هاتووە. بەڵام لە ئەنادۆڵدا عەلەویەت رۆڵی ئایدیۆلۆژیای رکەبەری کۆمەڵایەتی دەبینێ. بەبۆچوونی من لێکچواندنی رکەبەری تورکمانی ئەو کاتە بە کۆمۆنیستی ئەمڕۆ لێکچواندنێکی راست و

لەشـــوێنی خۆیدایـــە. ئـــەمڕۆش بنکـــەی عەلەویەتگـــەری بەسروشـــتی پێشـــکەوتنخوازانەی روون و بەرچـــاو جیادەکرێتـــەوە. باشـــترین رێگـــا بـــۆ بەگەڕخســـتنەوەی ئـــەو بنکەیـــە لـــەڕۆژی ئەمڕۆمانـــدا ژیاندنـــەوەی گیـــانی بەرخودانی تورکمانەکانە کە بەدرێژایی مێژوو لەئارادا بووە.

**عەبدوڵڵا نـۆج ئـالان:** ئـەو دوو دەوڵەتـە تـا دواڕادە سـوڵتانیان خسـتبووە دڵـەڕاوکێوە، ئەگـەر دووچـاری شکسـت نەبوونایـە، لەوانـەبوو ئەنادۆڵیشـیان تێپەڕاندبایە، ئەو کاتە سوڵتانی عوسمانی لە باڵقان دەبوو و لـەوێش بـەدواوە بۆ بێزەنتییەکان. هەر بۆیـە ئەگـەر بمانـەوێ سـوڵتان سـەلیم پێناسـە بکـەین، دەکرێ بڵێین: ئەو سوڵتانە بوو کە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کردە رۆژهەڵاتی و رێگەی نەدا ببێتە ئیمپراتۆرییەتێکی نوێی بێزەنتی. ئـەوەی جێـی سـەرنجە 500 ساڵ دوای شـەڕی مـەلازگرت سـوڵتانی عوسمـانی هەوڵـدەدات کۆتـایی بـە هەردوو دەوڵەتی سەفەوی و فـاتمی بهێنێ، ئـەو دوو دەوڵەتـە رکەبـەری هـەرە بەهێزی بوون، بەتایبەتی تا رووباری فورات و چیاکانی تۆرۆس درێژبببوونەوە و تۆڕی سیخوڕیان لە هـەموو شـوێنێك بڵاوکردبـۆوە. لـەو قۆناخـەدا هەنـدێك کەسـایەتی لەسـەر ژمارەیـەك میرنشـین دەسـەڵاتدار بـوون، وەك ئیدریسـی بەدلیسی کە میرنشینی بەدلیسی بەڕێوە دەبـرد و لـەژێر دەسـەڵاتیدا هەنـدێك میرنشینی بچووکی تریش هـەبوون. بەرچاوترین تایبەتمەنـدی ئەومیرنشـینە کە لەسـەر مەزهـەبی سـوونی بـوو، دەیخواسـت لـەژێر کاریگـەری و حاکمیـەتی دەوڵەتی سەفەوی ئێرانی رزگـاری ببێـت. پێشـتریش سـەفەوییەکان 23 مـیری کوردانیـــان زینـــدانی کردبـــوو، ئەمـــە لەکاتێکـــدا مـــیری بـــەدلیس لەگشـــتیان بـەهێزتربوو و بـە دوای رێگایـەك دەگـەڕا تـا لەدەسـت سـەفەوییەکان رزگـاری ببێـت، ئیدریسـی بەدلیسـی نووسـەری ئـەو مـیرە بـوو، بەواتایـەك لـە واتاکـان راوێژکار و ئاراستەکاری بـوو. هەربۆیـە پەیوەندیـەکانی خـۆی لەگـەڵ کۆشـکی عوسمـانی پتـەو و تۆکمـە دەکـات و لێیـەوە دەخـوازێ رێگـای رزگـاربوون لـە سەفەوییەکان بدۆزێتەوە. ئـەو گەڕانـە بـۆ ماوەیـەکی درێـژ بـەردەوام دەبێـت، هـەروا لەخۆیـەوە نایەتـە ئـاراوە، سـوڵتانیش بـێ ئـەوەی کـات بـەفیڕۆ بـدات پەیوەنـدی لەگەڵیانـدا دەبەسـتێ، چـونکە ئـەویش پێویسـتیەکی زۆری بـەو پەیوەندییە هەبوو، بۆ پاراستنی ئیمپراتۆرییەت دەبوایە لەیەك کاتـدا شکسـت بە سەفەویی و فاتیمییەکان بهێنێت، یاخود بەلایەنی کەمەوە ناچاریان بکـات بـۆ سـنووری سروشـتی خۆیـان بکشێنەوە. لـەو روانگەیـەوە لەگـەڵ ئیدریسـی بەدلیسی نامە دەگۆڕێتەوە. لە یەکێك لەو نامە گۆڕینەوانەدا دەفتەرێکی سپی بەمۆری سوڵتان مـۆرکراوی بـۆ دەنێرێـت و پێـی رادەگەیـەنێت کـە دەسـتڕۆیی

ئـەوەی هەیـە بـەناوی سـوڵتانەوە چـەندەی بخـوازێ ئیـمزا بکـات و چـەندیش بخوازێ دەتوانێ فەرمان دەربخات.

**میهری بەللی:** دەڵێت:"کێ چەندی لە دەستڕۆیی دەوێت پێی ببەخشە" لە ئیمزای سەر لاپەڕەی سپی دەچێت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ... پێی ڕادەگەیەنێ کە چەندە بخوازێ دەتوانێت فەرمان دەربخات و بڕێکی زۆری لەزێڕ بۆ نارد و خستیە خزمەتیەوە، مەسەلە دەگاتـە ئـەو ئاسـتەی پێـی رابگەیـەنێ:"لـەناو خۆتانـدا بـەگێگ هەڵبـژێرن". هـەروەها دەڵێـت:"لێـرەدا بـەدەیان بـەگ هـەن، ئەمـەش زۆرە، رێکخسـتنی پەیوەندی لەگەڵ هەموویان زەحمەتە، ئەگەر بەگێکتان هەڵبژارد، ئەوا لەیەك تیگەیشتن ئاسان دەكات" وەك تێبینیش دەکەن ئێرە شوێنی زەبروزەنگ نییە، بـەڵکو هەوڵیـداوە لەسـەر ئاسـتی دەوڵـەت هاوپـەیمانێتی ببەسـتێ، کـە سـوڵتان سەلیم و ئیدریسی بەدلیسی بونیادنـەری ئـەو هاوپەیمانێتییـەن. بەدلیسـیش بەمجۆرە وەڵامـی دەداتـەوە "نـەخێر، ئێمـەی بەگـە کوردەکـان لـەنێو خۆمانـدا لەیـەك تێناگـەین، ئەگـەر ئەمـە بکرایـە ئـەوا میرێکـی کـورد دەردەکـەوت و حـوکمی هـەموویانی دەکـرد و کاروبارەکانیـان بـەڕێوە دەبـرد". ئەحمـەدی خانیش وەك خۆزگەیەك ئاماژە بـەو خاڵـە دەکات و دەڵێـت:"خۆزگـە ئێمـەش میرێکمـان دەبـوو". وەك دەزانـن باڵادەسـتی میرێـك و ئـاواکردنی میرنشـینێکی ناوەندی مەسەلەیەکی هەروا ئاسان نییە. هەربۆیە میرە کوردەکـان بانگهێشتی سوڵتان سەلیم دەکەن بۆئەوەی کە ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە و حـاکمێکی گشـتی دەستنیشان بکات. بۆیە پێم وایـە بـۆ ئـەم کـارە ئەسـکەندەر بـەگ دەنێرێـت و ئەویش هێزی کوردان کۆدەکاتەوە، ئەمە لەکاتێکدا هێشتا هێزی عوسمانیـەکان نەهاتبووە کایەوە، بەڵکو تا ئەوکاتـەش هەمووشـتێك بـەناوی کوردانـەوە بـوو. ئەولیا چەلەبی لەبارەی ئەو قۆناخەوە دەڵێت:" ژمارەیەکی زۆر لە میرنشین و دەوڵەتۆکە هەبوون. کۆشکی میری بەدلیس لە کۆشکی ئەستەمبوڵیش گەورەتر و شـکۆمەندتربوو، پەرتوکخانەکەشـی بەهـەمان شـێوە، هـەروەها سـوپایەکی دەیـان هـەزار کەسـی هـەبوو". ئەمـەیان تـەنیا میرنشـینێکیان بـوو، میرنشـینی هـەکاری و میرنشـینی دیاربـەکریش هـەبوون. ئـەو میرنشـینانە خـاوەنی سیستەمێك بوون زۆر لە میرنشینەکانی ئەوروپا پێشکەوتوتر بـوو. هەربۆیـە سوڵتان سەلیم ــ لـەم رووەوە مافداریشـە ــ بـەدوای رێگـەی هاوپەیمانێتییـەك دەگەڕا. لێرەدا نامەوێ ئەم بابەتە فراوان بکەم چونکە لەمێـژوودا سـەلمێنراوە و گفتوگـۆ نـاخوازێ. سـەرباری ئەمـەش مـیرە کوردەکـان پێویسـتیان بـە هاوپەیمانێتییەکی بەمجۆرە هەبوو. چونکە سەفەوییەکان فشاری مەزهـەبی و

سیاسی توندیان بەسەریاندا پیادە دەکردن و 23 میری کوردانیان زیندانی کردبوو.

یەکەمین بەرهەمی ئەو هاوپەیمانێتییە سەرکەوتن بوو لە شەڕی چالدێراندا. ئەگەر چی ئەو شەڕە وادیار بوو کە شەڕی عوسمانی ــ سەفەوییەکانە، بەلام لەڕاستیدا سەرکەوتنی میرە کوردەکان بوو بەسەر سەفەوییەکاندا، لەکاتێکدا ڕۆلی سولتان تەنیا ڕێکخستنی کاروباری ئەو شەڕە و پشتگیری کردنی بوو بەئینکشارییەت. بەلام وەك مێژووش جەختی لەسەر دەکاتەوە، بەکردار ئەوەی زیاتر شەڕی کرد هێزی میرە کوردەکان بوو. دوای ئەم سەرکەوتنە مولکی ئیمپراتۆرییەت تا شاری تەورێز و ناوچەی قەفقاسیا و بەغداد درێژ دەبێتەوە. جێی باسە ئەو شەڕە لەسالی 1514دا هەلگیرسا. دوای ئەمە یەکسەر تەواو لە سالی 1517دا دەسەلاتی ئیمپراتۆرییەت بەپشتیوانی ڕەهای کوردەکان تا باشووری ئیستای کوردستان ڕۆیشت. هەروەها لە ئەنجامی سەرکەوتنیان لە شەڕی "مەرج دابیق"دا کە لەپال حەلەبدایە، دەروازەکانی سوریا کەوتە سەرپشت. لە بەدیهێنانی سەرکەوتن لەو شەڕەدا میرە کوردەکانی دیاربەکر و ماردین ڕۆلێکی مەزنیان گێڕا. دوای شەڕی "ڕیدانییە" سەرکەوتن بەسەر دەولەتی فاتیمی میسری، مولك و دەسەلاتی عوسمانییەکان تا نیمچە دوورگەی عەرەبی و باکووری ئەفریقا درێژ دەبێتەوە، بەمەش دەبێتە ئیمپراتۆرییەتێك کە سێ کیشوەر لەخۆی بگرێت و بەشان و شکۆ بێت.

دەتوانین لەمەدا چ دەرەنجامێك دەربخەین...؟ ئەمە پرسێکی گرنگە و پێویستی بە وەلامدانەوە هەیە. ئێمە زێدەڕۆیی ناکەین و مەسەلەکان گەورە ناکەین، گشت ئەو مەسەلانە بە بەلگەی مێژوویی سەلمێنراون. ئەگەر کوردان نەبوونایە داخوا سولتان سەلیم دەیتوانی بگاتە ڕووباری فورات؟ ئایا دەیتوانی سوریا بەدەست بخات و بەرەو چیاکانی تۆرۆس هەلکشێ؟ بێگومان نەخێر! لەسەرەتادا بۆ جێگیرکردنی پێی خۆی و تۆکمەکردنی دەسەلاتەکەی خێل و عەشیرەتە کوردییەکان هاوکارییان کرد، بۆئەوەی لەئەنادۆل دەربچێت و بەرەو ڕۆژهەلاتی ئاراستە وەربگرێت هەر ئەوانیش هاوکارییان کرد تا بووە ئیمپراتۆرییەتێکی بەرفراوان و بەهێز. ئەو ڕاستیە ڕوونە و بێ تەم و مژە. وەك دەزانرێت دواتر پێنج حکومەتی کوردی و چەندین میرنشینی تر سەریانهەلدا، هەموویان لەلایەن سولتانەوە فەرمانی لەسەر درابوو. گشت ئەو حکومەتانە لەڕووی سیاسی و عەشیرەتییەوە میراتگیری بوون، لە باوکەوە بۆ کوڕ دەگوازرایەوە. لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە لەو قۆناخەدا کوردان بێ سیاسەت و حکومەت نەبوون، بەلکو بێ سولتانێك بوون کاروبارەکانیان بەڕێوە

ببات، ئەمەش دەرئەنجامی نەبوونیانە بەناوەندێك لەو ساتانەدا، ئیتر سوڵتانی عوسمانیش ئەو بۆشاییەی پڕکردەوە.

**میهـــری بـــەللی:** لەوکاتـــەدا ســـوڵتانی عوسمـــانی ســـیفەتی خەلیفـــەی موسڵمانانیشی هەڵگرتبوو. لێرەدا هۆکاری ئایینی گرنگییەکی مەزنی هەیە.

**عەبدوڵڵا نۆچ تـالان:** ئـەو هۆکارە، هۆکـاری هـەرە بەرچاو بـوو کـە لەسـەر ئیمپراتۆرییەت حوکمی دەکرد. ڕەوشێکی هاوشێوەی ئـەوەی باسمان کـرد لـە تورکیـا یـان نیمچـە دوورگـەی عـەرەبی یـاخود ئەنادۆڵـدا لـەئارادا نـەبوو، لەبەرئەوە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ئیمپراتۆرییەتێکی تورك و کـوردان بـوو، بەتایبـەتیش لـە سـەرەتای سـەردەمی سـوڵتان سـەلیم دا، دەبێ ئـەوە لـە هـیچ کاتێکدا لەیاد نەکرێت.

ئەو ڕەوشە تا سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام دەبێت، بەتایبـەت لـە سـەردەمی حـوکمڕانێتی سـوڵتان مـەحمود کـە جیاوازییـەکی نـوێ دەردەکـەوێ. بـەکورتی ئامـــاژەکردن بـــەو بابەتـــە زۆر ســـوودمەندە. وەك دەزانرێـــت لەبەرامبـــەر سەرمایەداری پێشکەوتوودا دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی عوسمـانی لـە ڕۆژئـاوای ئـەوروپادا بەشـێوەیەکی خێـرا دێتـەوە باریـەك و، لـەوەش زیـاتر، هەڵمـەتی محەمـەد عـەلی پاشـاش هـەبوو کـە دەسـت و مەچـەکی خـۆی لەمیسـردا توندکردبوو. ڕۆڵی ئینگلیز لە گەشەکردن و زێـدەبوونی دەسـەڵاتی مەحەمـەد عەلیدا کەم نەبوو. دوای باڵادەست بوون و حوکم کردنی میسر دەسـەڵاتەکەی تـا چیاکانی تـۆرۆس و تـراکیـا چـوو، بەڕادەیـەك لەسـاڵی 1830دا خـەریکبوو بەسەر ئەستەمبوڵیش باڵادەست بێت. بەڵام دەستێوەردانی ڕوسیا و فەرەنسا و ئینگلیـــز تـــوانی هـــەتا بـــەرەو ئیمپراتۆرییـــەتی بێنێتـــەوە. لەواقیعیـــدا ئیمپراتۆرییەت هەر لەساڵی 1830وە کۆتایی پێهاتبوو، لە شوێنیدا بنەچەی میسری، بنەچەی محەمەد عەلی پاشا شوێنی دەگرتـەوە، بـەڵام دەسـتێوەردانی ڕوسیا و فەرەنسا و ئینگلیز نەیهێشت ئەمە بەدیبێت.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە سوڵتان مەحمود هانای وەبەر ڕوسە سـلاڤییەکان بـرد بـۆ ئـەوەی کۆتاییـەکی مەرگەسـاتانەی نـەبێت، بەمـەش ڕوسەکان بۆ یەکەم جار هاوکـاری تورکـەکانیان کـرد و لەسـەردەمی قەیسـەردا هەوڵیانـدا تورکـەکان نەبـەزێن. بـۆ دووەم جـاریش بەلشـەفیەکانی ڕوسـیا هاوکارییـان کـرد و هەوڵیانـدا بـۆ ئـەوەی لـە ئـەنادۆڵ لەناونەچـن. مێـژوو نووسـەکان تـاوتوێی ئـەو مەسـەلانەیان نـەکردووە، بـەڵام وەك ڕاسـتییە بەرچاوەکان دەمێننەوە، ئەگەر هاوکاری ڕوسەکان نەبوایە ئەوا محەمەد عـەلی پاشا دەبووە سوڵتانی نوێی ئەستەمبوڵ.

هەڵبەتە لێرەدا سوڵتان مەحمود هەندێك دەرەنجامی وەرگرت، بینی كە زۆر پێویستی بەوە هەیە باجەكان زێدە بكات و ئاستی بە سەربازبوون بەرزبكاتەوە، بۆئەوەی ئیمپراتۆرییەت رێكبخاتەوە و تۆكمەی بكات و ئابوورییەكەی بەهێز ببێت، لە رۆژئاواوە رووە و ئەنادۆڵ ئاراستە وەردەگرێت، چونكە بزاڤە یاخی و هەڵگەڕاوەكان لە رۆژئاواوە دەستیپێكرد و رەوتە نەتەوەییەكان بڵاوببوونەوە. بەرەو رۆژهەڵات ملی نا كە كورد و عەرەبەكانی لێبوون. زیاد كردنی باجەكان و بەرزكردنەوەی ئاستی بە سەربازبوون واتە تێكدانی سیستەمی كۆن، چونكە ئەو كاتە كوردەكان باجەكانیان بۆ خۆیان دەپاراست و بەپێی ئەو سیستەمە كۆیان دەكردەوە و بەسەربازبوونیشیان بۆ بەرژەوەندی میرنشینەكەیان بوو. واتە كۆكردنەوەی باجەكان و بەسەربازبوون راستەوخۆ بەناوی عوسمانییەكانەوە نەبوو. ئەوەی لە ئارادا هەبوو بەناوی میرەكان خۆیانەوە هەندێك دیاری و خەڵاتیان پێشكەش دەكردن، بێ ئەوەی عوسمانییەكان خۆیان باج كۆبكەنەوە و بە سەربازبوون ئەنجام بدەن. كاتێك سوڵتان مەحمود هەوڵیدا پێچەوانەی ئەمە هەڵسوكەوت بكات، ئەوا لە ئەنجامدا قۆناخی سەرهەڵدانی گشتگیر دەستیپێكرد و سەدەی نۆزدە بەتەواوی دەبێتە سەدەی سەرهەڵدانەكان. هۆكاری سەرەكی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو لۆژیكەی:"هەرگیز نابین بە سەربازی دەوڵەتی عوسمانی، هەرگیز باجی نادەینێ". ئەمەش خۆی لەخۆیدا رشت بوون بوو لە سیستەمی كۆن. لەڕۆژی ئەمڕۆدا ئەم رەوشە تا رادەیەكی زۆر لێكچووی رشتبوونی بارزانییەكانە لەسەر ئۆتۆنۆمی.

**میهری بەللی:** بەرپابوونی شۆڕشی پیشەسازی لە ئەوروپا و فراوانخوازی داگیركەرانە و، بێ توانای ئیمپراتۆرییەت لە هەڵكردنی لەگەڵ پێشكەوتنەكانی سەردەم و بوونی بە نیمچە داگیركراو، هەموو ئەمانەش رۆڵێكی كاریگەرانەیان هەبوو. شانبەشانی گشت ئەمانەش سەروەت و سامانی دەوڵەتی عوسمانی دەكەوێتە بازاڕی سەرمایەدارییەوە. ئەو پێشكەوتنە پەیوەندییەكی تۆكمەی بە پێشكەوتنی مەیلە نەتەوەییەكانی گەلانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتەوە هەیە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لە واقیعدا باشترین نموونەی ئۆتۆنۆمی ئەوەیە كە لەسەردەمی عوسمانییەكاندا لەئارادا بوو، ئەو كاتە چەندین دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی بەرفراوان هەبوون. كاتێك لە سەردەمی سوڵتان مەحموددا مەترسی هاتە سەر دەسەڵاتە ئۆتۆنۆمییەكان، سەرهەڵدانی مەزن و بەرفراوان بەرپابوون. وەك دەزانن لە ئەنجامدا ئەو سەرهەڵدانانە دووچاری شكست دەبنەوە، یاخود بەواتایەكی دیكە بەدرخان دەڕوا و یەزدانشێر دێت، ئەویش

دەڕوا و عوبێدوڵڵا دێت. بەڵام لەئاکامدا سوڵتان عەبدولحەمید سیاسەتێکی نوێ و سەرسووڕهێنەر دادەڕێژێ، سیاسەتێکی کۆن بوو بەڵام درەنگ کەوت، واتە سیاسەتی سەرلەنوێ لەیەك تێگەیشتن (تفاهم) لەگەڵ کوردان، بەڵام ئەو جارەیان بەشێوەیەکی جیاواز، لە چوارچێوەی لیواکانی حەمیدی. ئەمە بەچ واتایەك دێت؟ واتە: سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی میرنشینە کوردییەکان و وەك ژەنەڕاڵەکان میرەکانیان دەستنیشان بکرێن و خوێندنگای تایبەتیان بۆ بکرێتەوە. لەسەر ئەو بنچینەیە 36 میرنشینی کوردان دادەمەزرێ. وا مەزەندە دەکەم سوپایەکی 36 هەزار جەنگاوەرییان پێکهێنا بوو. ئەمەش واتای ژیاندنەوەی دەرەبەگایەتییە لە کوردستان و نوێکردنەوەی تەباییە لەگەڵ عوسمانییەکاندا بە سەرۆکایەتی سوڵتان عەبدولحەمید، ئەو سیاسەتە تا سەردەمی مستەفا کەمال، واتە تا دامەزراندنی کۆماری تورکیا، بەردەوام دەبێت. بەدەربڕینێکی دیکە دەکرێ بووترێ کوردان لەسەر بنچینەی لیواکانی حەمیدی لەگەڵ سوڵتانی عوسمانییەکاندا لە تەباییدا بوون.

**میهری بەللی:** لەسەر ئەو بنەمایە دەکرێ بووترێ ئەو سیاسەتەی لە سەردەمی کۆماردا بۆ بەتورککردنی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا جێبەجێ کراوە لە درێژایی مێژووی تورکەکاندا نموونەی نییە. ئەو حکومەتانەی بەر لە کۆمار، مۆزاییکی گەلانی ئەنادۆڵیان لەبەرچاو گرتووە و لەسەر ئەو بنەمایەش سیاسەتیان کردووە.

**عەبدوڵڵا نۆچ تالان:** ئەوەی جێی سەرنج بێت لەو تەباییەدا دژایەتیکردنی ئەرمەنییەکان بووە بۆ ئەو تەباییە و بەرەنگاربوونەوەیانە لەبەرامبەر بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد. لەمەدا لێکچوونێکی سەرسووڕهێنەر هەیە لەنێوان ئەوان و بزووتنەوەی بارزانییەکان کە تەبابوون لەگەڵ کۆماری تورکیا و دژایەتیکردنی بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان، لەگەڵ ئاماژەکردن بە نەبوونی بزووتنەوەیەکی ئەرمەنی لەڕۆژی ئەمڕۆماندا. لەو کاتەدا ئەو میر و بەگانەی کوردان ـ کە دەتوانین ناوی کۆنەپەرستەکانیان لێ بنێین ـ لەگەڵ عوسمانییەکان لە تەباییدا بوون، لە هەمانکاتیشدا دژایەتی بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردان و ئەرمەنییان دەکرد، هەروەها بوونە هۆکاری هەڵگیرسانی ململانێی خوێناوی. ئەوەی لێرەدا گرنگە یەکگرتنی کوردانە لەگەڵ دەوڵەتی تورکیدا، یاخود ڕاستر بڵێین لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا، لەسەر بنەمای هاوپەیمانێتی، مەسەلەکە ڕوون و دیارە: 36 میرنشینی کوردان و هەر یەکێکیان هەزار چەکداریان هەیە، هەر یەکەو خوێندنگای تایبەتی خۆی تەنانەت لە ئەستەمبوڵیش هەیە. ئەو ئۆتۆنۆمییەی ئەمڕۆ گفتوگۆی لەسەر دەکەن، ئەو کاتە بەکامڵترین شێوە لە ئارادا بووە، بێ ئەوەی سیاسەتی

تواندنەوە دەرهەق بەکوردان پەیڕەو بکەن، تەنانەت هەمووشتێك بە زمانی کوردی بەڕێوە دەچوو. هەروەها ئەو کاتە ئیبراهیم پاشا هەبووە کە لە وێرانشارەوە تا ئورفا و موسڵ و دیاربەکر حوکمی کردووە، دیسان بەدرخان بەگ هەبووە، ئەوە لەمێژوودا لەسەری نووسراوە راشکاوانەیە و دەمەتەقێی ناوێ. لەوانەش زیاتر دەوڵەتی مەروانییەکان هەبووە کە لەسەردەمی سەلجوقییەکاندا بووە و سەدەیەك زیاتر بەردەوام بووە.

کەواتە؛ قەوارە کوردییەکان تا سەدەی نۆزدە لەئاستێکی پێشکەوتووی رێکخستندا بەردەوام دەبن. هەربۆیە بە ووتەی وەکو:"ئایا کوردان دەوڵەتیان هەبووە یاخود نا؟ لەئاستی رێکخستنی عەشیرەتیدا ماون..." ووتەی زێدەڕۆن و راست نین. دەبێ لێرەدا ئەو دەرئەنجامە سیاسییەی لێ دەربخەین کە کوردان تا سەردەمی ئیتحاد و تەرەقی لەسەر ئەو رەوشە بەردەوام دەبن.

عەبدوڵڵا جەودەت ـ تیۆریزانێکی ئیتحاد و تەرەقی ـ بەرەچەڵەك کوردە و چەندین کەسێتی دیکەی هاوشێوەی ئەو بەیەکەوە دژی ستەمکاری تێکۆشاون. هەروەها دەزانرێت کە رووناکبیرە کورد و تورکەکان بەیەکەوە "مەشروتییەت"یان ئامادە کردووە، لەسەرەتای ئەو سەردەمەدا چەندین رۆژنامەی کوردی دەردەچوو و چەندین کۆمەڵەی کوردی دامەزراون، کە ژمارەیان لەوانەی تورکەکان کەمتر نەبووە. ئەمە رەوشێکی سەرسووڕهێنەرە کە هێشتا شۆڤێنیزم دەرنەکەوتبوو و دوژمنایەتی نێوان هەر دوو گەل لەئارادا نەبوو، تەنانەت لە سەرەتای سەردەمی ئیتحاد و تەرەقیش بەهەمان شێوە بوو. ئەو جۆرە مەیلانە لە ماوەی دوای ئەوە دەرکەوت، بەتایبەتی لەسەردەمی دەسەڵات گرتنە دەستی تەلعەت پاشادا. ناخوازم بکەومە نێو قووڵایی ئەو مێژووەوە. ئەو ساڵانە بەواتایەك لەواتاکان لە هەمانکاتدا ساڵانی پێشکەوتنی بۆژوازییەتیشە. پێکهاتە سەرەتاییەکانی چینی بۆرژوازییەت دەستیان بەسەر سەروەت و سامانی کەمەنەتەوەکان، بەتایبەتی ئەرمەن و رۆمییەکاندا گرت. تەلعەت پاشاش لەو پرۆسەی تاڵانکردنە رۆڵی سەرەکی بینی.

دواتر و لەژێر کاریگەری جەنگی یەکەمی جیهانی و لەئەنجامی داڕووخانی ئیمپراتۆرییەتدا داگیرکردنی ناوچەی ئەنادۆڵ لەلایەن ئینگلیز و فەرەنسا و ئیتاڵیاوە دەستی پێکرد. لەوەش زیاتر یۆنانستان دەخزێتە قووڵایی ئەنادۆڵەوە. لەبەر ئەوە کێشەکە سەبارەت بەتورکەکان، تەنانەت سەبارەت بەکوردانیش، دەبێتە کێشەی مان و نەمان. لەسەر ئەو بنچینەیە شەڕی رزگاریخوازی نەتەوەیی تورکیا دەستی پێکرد، راستر وایە تەنیا وەك بزاڤی

رزگاریخوازی نەتەوەیی تورکیا نەیبینین و ناوزەدی نەکەین، چونکە ئەو شەڕە لە عەنتاب و مەرعەش و ئورفاوە دەستپێکرد.

لەوێدا کلپەی یەکەم هەڵگیرسا، بەر لەوەی مستەفا کەمال دەست پێبکات و بچێتە ئەنادۆڵ. لە ئورفا گوێم لەو کەسانەبوو کە بەشداری ئەو شەڕەیان کردبوو دەیانگوت:"سەرەتا لێرە و بەشێوازی شەڕی گەریلایی شەڕەکە دەستپێکرد". ئەمە یەکەم شەڕە کە لەدژی داگیرکاری ئیمپریالیستی بکرێت، بەشداربوونی کوردان لەو شەڕە بەڵگە نەویستە و پێویست بە دەمەتەقێکردن ناکات. راستە تورکەکان لە عەنتاب و مەرعەشدا بەشدارییان تێدا کرد، بەڵام مسۆگەر کوردان لە ئورفا ئەو شەڕەیان دەستپێکرد. راستە مێژوو نووسەکان زۆریان لەسەر نووسیوە ـ ئەگەر پێویست بکات سەرلەنوێ گفتوگۆی لەسەر دەکەین و هەڵیدەسەنگێنینەوە ـ بەڵام روون و ئاشکرایە کە مستەفا کەمال بەئامانجی گەڕانەوەی ئاسایش و جێگیری دەچێتەوە بۆ ئەنادۆڵ. بەڵام کاتێك چارەسەرنەبوونی مەسەلەکەی بۆ دەرکەوت و بۆی مسۆگەربوو کە هەردەبێ قۆناخی رزگاری نیشتمانی دەست پێبکرێ، هەروەها پاشایەتی (سەڵتەنەت) کۆسپێکی نەزۆکی سەر رێگایەتی، بەپەلە هەڵسەنگاندنێکی راستی رەوشەکەی کرد و هەڵوێستی خۆی بەلای رزگاری نیشتمانی وەرگرت و لەو شەڕەدا وەك دوو توخمی سەرەکی پشتی بە تورك و کوردەکان بەست و لە گشتینامە (تعمیم)کەی ئەماسیادا بەو ووتەیە گوزارشتی لێکرد:" بۆ ئەوەی ئێمەی تورك و کورد لەژێر دەسەڵاتی بیانییەکان رزگار ببین....." وەك دەزانن گشتینامەی ئەماسیا بە مانیفێستۆی یەکەم دادەنرێت...

**میهری بەللی:** پێش ئەو نامانەش بوو کە مستەفا کەمال بۆ فەرماندەکانی سوپاکەی و هەندێك لە کەسێتییەکانی ئەستەمبوڵ ناردبووی، کە بانگهێشتی بەرخۆدان دەکات. ئەو نامە و چاوپێکەوتنەی لە حافازا لەگەڵ شاندی روسیادا کردی و ئەو نامانەی بۆ سەرۆك عەشیرەکان لە دیاربەکر ناردبوونی، دەرەنجامێکی پۆزەتیفانەی لە بەرژەوەندی مستەفا کەمال لێکەوتەوە. ئەو نامە ناوبراوانە لە کرۆکی خۆیاندا گوزارشت لەوە دەکەن کە کوردەکان ئامادەن بەشداری لەشەڕدا بکەن و سۆڤییەتیش ئامادەیە هاوکاری و پشتیوانی بکات ئەگەر دەست بە بەرەنگابوونەوە بکەن.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ دیاربەکر. ئەمە زۆر گرنگە. وەك دەزانن مانیفێستۆ واتە چوارچێوە و راگەیاندنی دەستپێکردنی کارێك.

**میهری بەللی:** بێگومان، بەفەرمی راگەیاندنی.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** هەبوونی کوردان لە مانیفێستۆی ئەماسیا و بەیاننامەی ئەرزڕۆمدا زۆر روون و دیارە، هەروەها لە بەیاننامەی سیواس و

پێکهاتەی یەکەمی پەرلەمان لە ئەنکەرا، کە کوردان لـە هەمووشـتێکدا بـەجلی خۆیان بەشدار دەبن و بەزمانی کوردیش گفتوگۆ دەکەن، بەبێ هیچ رووبەڕوو بوونەوەیەك. مەسەلەکە مستەفا کەمالی گەیاندە ئەو رادەیـەی لـە وتەیەکیـدا کە لە ساڵی 1923 لە قۆجەئیلیدا پێشکەشی کرد بڵێت:"ئێمـە ئۆتۆنۆمییـەك بەکوردان دەدەین" ئەوەی لێرەدا گرنگە، لەو قۆناخـە هەسـتیارەدا پەیوەنـدی کـورد و تـورك کەوتــە نێـو سـەردەمێکی نوێـوە. وەکـو پێشـتریش بۆتـانم شرۆڤەکرد کە لە رابردوودا پەیوەندی کورد و تورك پشتی بـە نکوڵیکردن و پاکتـاوکردن نەدەبەسـت، بـەڵکو پەیوەندییـەکان لەسـەر بنچـینەی لەیـەك تێگەیشـتن و هاوپـەیمانێتی بـوو و کـوردانیش خـاوەنی هێزێکـی سیاسـی و سەربازی بوون، ئەگەر چی لەسەر ئاستی چینە باڵادەستەکانیشەوە بێت.

**میهری بەللی:** ئەو سـەرکەوتنەی لـە شـەڕی رزگاریـدا بـەدیهات بەرهـەمی ئەو رێککەوتنە بوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** گومانی تێدا نییە....! ئێوە لـەمن باشـتر دەزانـن. واتـە ئــەو بزاڤــەی مســتەفا کــەمال رێبەرایــەتی دەکــرد لــە بنەڕەتــدا پشــتی بەهاوپــەیمانێتی کــورد ـــ تــورك دەبەسـت. ئەمــە زۆر روون و ئاشــکرایە و بەپێویستی نازانم بەفراوانی شرۆڤەی بکەم. بەڵام پاشان کێ لەگەڵیـدا نـاکۆك دەبێــت....؟ ئەمــە بابــەتێکی تــری گفتوگۆیــە. بــەڵام ئــەوەی ســەلمێنراوە سەرکەوتنەکە بەهۆی ئەو رێککەوتنەوە بەدەست هات کە باسمان لێیەوە کـرد. بە دەربڕینێکی تر ئەگەر کوردان نەبوونایـە نـەدەتوانرا بنچینەکانی کۆمـاری تورکیا دابنـرێت، تەواو وەك چۆن بەبێ پشتیوانی کوردان چوونە ئـەنادۆڵ بـێ ئــەنجام دەبــوو، توانــای ئــەوەش نــەبوو ئیمپراتۆرییــەتێکی بــەهێز بــەبێ بەشـداربوونی کـوردان پێـك بێـت، هـەمان شـتیش سـەبارەت بـەکۆمار، ئەگـەر کوردان نـەبوونایە دانەدەمەزرا. لێرەدا ئەرکی ئێوە ئەوەیە، پەیوەندی کـورد و تورك بەدرێژایی ئەو 500 ساڵە هەڵبسەنگێنن کە وەك بەردی بناخەی گشت قۆناخێکـە. دەگەڕێمـەوە و دووپـاتی دەکەمـەوە: ئەگـەر ئـەو هاوپەیمانێتییـە نەبوایــە کۆمــار دانەدەمــەزرا. بــۆ نموونــە: بۆچــی مســتەفا کــەمال بــۆ دەستپێکردنی شەڕ نەچووە ئەزمیر؟ وادابنێ چووە ئەوێ، ئایا دەیتوانی دەست بەشتێك بکات و کارێك ئەنجام بدات...؟ وەك دەزانن ئەگەر بۆ ئـەوێ بچووایە ئـەوا مێـژوو شـتێکی دیکـەی دەووت. بۆچـی لـە ئەسـتەمبوڵ یـاخود ئەنکـەرا نەمایـەوە و بەتایبـەت ناوچـە کوردنشـینەکانی هەڵبـژارد...؟ بۆچـی یەکـەم نامـەی ئاراسـتەی کـوردان کـرد..؟ چـونکە پیـاوێکی زیـرەك بـوو، کوردەکـان هێزێکـی بەشـان و شـکۆ بـوون و لـە میانـەی شـەڕەکەدا کاریگـەرییان لەسـەر هاوسەنگی هێزەکان دەکرد.

**میهـــری بـــەللی:** ئـــەو بەشـــێوەیەکی بـــاش دەرکـــی بـــە پێویســـتی ئـــەو هاوپەیمانێتییە دەکرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لەو پێداویستییە تێدەگات و بەچاوی خۆی دەبینێ کە هەرگیز ناتوانێ بەبێ کوردان لەو شەڕەدا سەربکەوێ.

**میهـــری بـــەللی:** ســـەرباری ئـــەوە، دەرك بەپشـــتیوانی روســـیای ســـەردەمی شۆڕش دەکات.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** هەربۆیـە هاوپـەیمانێتی لەگـەڵ هەردووکیانـدا دەکـات، لەگـەڵ کـورد و بەلشـەفییەکان. بـەو واتایـەی لەسـەرکەوتنی بزاڤـی رزگـاری نیشتمانی و پاشـان ئـاواکردنی کۆمـار قـەرزارباری ئـەو دوو هاوپەیمانێتییـەن. دەبێ کەس خۆی نەخەڵەتێنێ و بڵێت:"کۆمار لەسەربنەمای لێدانی کـوردان و ژێر پێخستنییان و لەدەستدانی هەموو شتێکیاندا ئاواکرا".

**میهری بەللی:** بێگومان نا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵام سەرنج بدە. ئەوە ئەو گوزراشتەیە کە پاشان بـاو بوو. وەك دەیبینین دوای سەرهەڵدانی شێخ سەعید یەکسەر هەموو شتێك بـۆ ناوی تورکەکان گۆڕا و کۆتایی پێهات. هـەروەها ئایـدیۆلۆژیا شـێوەیەکی تـەواو جیـاوازتری وەرگـرت. پاشـان کۆمۆنیسـتەکان دووچاری پاکتـاوبوون بوونـەوە، بەڕاسـتی ئـەمـە جێـی سەرسـووڕمانە! ئایا وانییـە؟ واتـە لەگـەڵ کۆمۆنیسـت و بەلشەفییەکان دەستپێکرد و دواتـر بەبێ ئەوان بەردەوام دەبێت.

**میهری بەللی:** سـەرەتا لەگـەڵ کوردانـدا و دواتـریش بـەبێ ئـەوان. ئەگـەر ئێوە دەخوازن با بگەینە سەنتێزێك بەر لەوەی ئەو قۆناخە دەرباز بکەین.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** هەڵبەتە بەم شێوەیە باشترە.

**میهری بەللی:** ئەوەی سەلمێنراوە: لە گرنگترین پێچدانەوە مێژووییەکانـدا هاوپەیمانێتی کورد ـ تورك هـەبووە و بـەهۆی ئەمـەوە دەوڵـەت دادەمـەزرێ و بەردەوام هێزی پێدەبەخشێ و ئاسۆی نوێی لەبەردەمدا دەکاتەوە، پێشکەوتنی نەتـەوەیی بەدیـدێت، ئـەوەی لەمیانـەی شـەڕی رزگـاریخوازی و لـە قۆنـاخـە جیاوازەکانی دیکەدا، هەر لە مەلازگرتەوە، روویداوە ئەوەیە. دەرەنجام ئەوەیـە رێڕەوی گشتی مێـژوو وەکو رۆژی ئـەمڕۆمان هەمیشـە هاوپـەیمانێتی کـورد ـــ تورکی سەپاندووە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** دێمە سەر شرۆڤەکردنی ئەو خاڵەش، بەڵام بـا سـەرەتا بەیەکەوە قۆناخی دامەزراندنی کۆمار هەڵبسەنگێنین.

**میهری بەللی:** بەڵێ منیش دەمـەوێ بیر و بۆچوونی خـۆم لـەم بارەیـەوە بخەمــە روو. تائێســتا چــەندین جــار ئــەوەم دووپــات کردۆتــەوە:" ئــەو نیشـتمانپەروەرە تورکـەی نکـۆڵی لـە نەتەوەیـەکی دیکـە دەکـات، لەکاتێکـدا

کۆمەڵێك نەتەوەی دیکەش هەبن، بەکردار نکۆڵییان لێ بکات، ئەوا نکۆڵی لە نیشتمانپەروەریێتی خۆشی دەکات".

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** بەڵکو دووچاری شکست دێت.

**میهری بەللی:** "دەکەوێتە ناکۆکییەوە و لەگەڵ مێژوودا یەکانگیر نابێتەوە". هەروەك هەڤاڵ ئۆجەلان ئاماژەی بەوەشدا: ئەوانەی ناوی کوڕەکانیان دەکەنە ئەڵپ ئەسلان و بانگەشەی قڕکردنی کوردان دەکەن، ئەوانە لە رۆژی ئەمڕۆماندا کارەساتێکی مەزن دەنێنەوە کە هەڕەشە لە تورکیا دەکات.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** بەمەش بانگەشەی قڕکردنی تورکانیش دەکەن.

**میهری بەللی:** سوکایەتی و خیانەتکردنە بە یادەوەری ئەڵپ ئەسلان.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئافەرین ...! خیانەتە.

**میهری بەللی:** لەو حاڵەتەدا ئەگەر هەر دەبێ ئاسۆیەکی نوێ بۆ وڵاتەکەمان بکەینەوە، کە هێزە دەسەڵاتدارەکان لەنێو رەوشێکی شەرمەزاریدا خنکاندوویانە، ئەگەر ئەو ئەرکە لە ئەستۆی ئێمەدایە ـ کە لەڕاستیشدا هەر وایە ـ بۆیە دەبێت یەکێتیەکی ئازادانەی نێوان هەردوو گەل بەدی بێنین و لەسەر بنەمای یەکسانی و ئازادی ژیانیان لە وڵاتێکی هاوبەشدا بخەینە گەرەنتیەوە. هەر بۆیە دەبێت هیچ یەکێك لە ئێمە ووتەیەك نەکات کە لەگەڵ ئەو ئامانجەدا یەکانگیر نەبێتەوە، ئیدی چ کورد بین یان تورك، لێرەدا کۆمەڵێك بەها هەیە کە هەردوولا پیرۆزی رادەگرن، ئێمەش لەسەرمانە رێزیان لێبگرین. هەر بۆ نمونە ئەگەر تورکێك لە هەڵسەنگاندنی خۆی بۆ سەرهەڵدانی شێخ سەعید کەوتە رەوشێکە و پێی وابێ: "سەرهەڵدانێکی جادوگەرانەیە و ئینگلیز لەبەرامبەر کۆماری عەلمانییەتدا وروژاندوویەتی" ئەوا نکۆڵیان لە رووەکەی تری مەدالیاکە کردووە، کە رۆڵی گەلە لەسەرهەڵدان و گەوهەرە نیشتمانپەروەرەکەی و، بەمەش رۆڵی لە تێکدانی یەکێتی ئازادانەی نێوان هەردوو گەل هەبووە. هەڵبەتە ناتوانین سەرهەڵدانی شێخ سەعید بە بزاڤێکی نیشتمانی دیموکراسیانەی کە سەرۆکایەتییەکی شۆڕشگێڕی رابەرایەتی کردووە، وەسف بکەین. بەڵام لەلایەکی دیکەوە گەلێك هەیە کە بە رووی زۆرداری و دوژمنایەتیدا راپەڕیوە. سەرۆکایەتییەکە هەر کێیەك دەبێت با ببێت، مسۆگەر ئەو بزاڤە لایەنێکی گەلێری و ناوەرۆکێکی نیشتمانپەروەرانەی هەیە کە ناتوانین خۆی لێ لابدەین.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** هەڵبەتە لایەنێکی بەمجۆرەی هەیە.

**میهری بەللی:** بابێینەوە سەر شەڕی نیشتمانیمان. وەك باسمان لێیەوەکرد، شەڕێکە هەر دوور گەل شانبەشانی یەکدی بەرپایان کردووە،

لەیەك ئاستدا بریتییە لە لاپەڕەیەكی پرشنگداری مێژووی هەردوو گەل. ئەو شۆڕشگێڕەی ئەمڕۆ دەجەنگێ بەردەوامی قەرەیلان و هەڵگری میراتەكەیەتی. نەك بەردەوامی بەدرخان بێت كاتێك هەستی بەمەترسی كرد یەكسەر سەروەت و سامانەكەی خۆی كۆكردەوە و پەنای وەبەر بالیۆزخانەی ئینگلیز برد و خۆی تەسلیمی لۆرد گیرسۆنی بالیۆز كرد. زۆر باش دەزانرێت ئەو پێشكەوتنانە بەدوای شەڕەكەوە هات، بەڵام رەوشی ئەو كاتەی داگیركردنی باشووری ئەنادۆڵ لە ساڵی 1919 لەلایەن سوپای فەرەنساییەوە چۆن بوو...؟ لەبەرەی یەكەمدا دەوڵەتە ئیمپریالیستەكان هەبوون كە لە جەنگی یەكەمی جیهانییدا بەسەركەوتوویی دەركەوتن و هەوڵیاندا دەوڵەتی عوسمانی بەتەواوی كۆتایی پێبهێنن و دەوڵەتی بچووك لە مەودای خۆیاندا دروست بكەن، بۆئەوەی بیكەنە خاڵی پێهەڵگرتن تاوەكو یەكەم دەوڵەتی سۆسیالیستی بخنكێنن كە هێشتا ساوابوو، بەڵام لەبەرەكەی تردا بریتین لە گەلە موسڵمانەكانی ئەنادۆڵ بەتایبەتی گەلی كورد و تورك، هەروەها شۆڕشی روسیا كە هاوپەیمانی هەردوو گەل بوو، ئەوەی لەو بەرەیەدان لەو باوەڕە دابوون كە بەرخودان لە دژی پیلان و نەخشەی ئیمپریالیستی كێشەی مان و نەمانە، ریزبەندكردنەكە بەمجۆرە بوو، كوردیش لایەنی راستیان هەڵبژارد. ئەمەش جێی شانازی و سەربلندییانە. لەو ساڵانەدا مستەفا كەمال لە نووسین و خیتابەكانی خۆیدا جەختی لەسەر یەك خاڵ دەكردەوە......

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئێمەی تورك و كورد.

**میهری بەللی:** بەڵێ ئەمە راستە:"ئێمەی تورك و كورد" تۆ كوردیت و هەمیشە وەكو كوردێك دەمێنیتەوە، منیش توركم و هەمیشە وەكو توركێك دەمێنمەوە، بێ ئەوەی تواندنەوە بوونی هەبێت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** تەواو وایە، هەر كەسێك بەناوی خۆیەوە بانگ دەكرا.

**میهری بەللی:** هەر بەم جۆرەش بوو. كوردان بانگهێشتنی كەمالیان بۆ تێكۆشان بەو وتەیە وەڵام دایەوە :"ئێمە بۆ تێكۆشانین". دوای ئەمە مستەفا كەمال وەڵامێكی پۆزەتیفانەی لەلایەن كورد و روسەكانەوە وەرگرت. كەمال نامەیەكی بۆ فەرماندەی لەشكر و دۆستەكانی لە ئەستەمبوڵ نارد و ناوەڕۆكەكەی بریتییە لە :"كوردان شانبەشانی ئێمە بۆ جەنگ ئامادەن، شۆڕشی بەلشەفیكیش پشتیوانمانە، وەرن بەرخۆدانی بكەین" "یا سەربەخۆیی یان مردن". ئەوەی مستەفا كەمالی كردە مستەفا كەمال دەرك كردنی بوو بەواتای ئەو دوو هاوپەیمانێتییە لە قۆناخێكی ئەوەندە دژواردا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەمەیە مستەفا كەمالی راستەقینە.

**میهری بەللی:** ئەمە لایەنە پۆزەتیفەکەیەتی. لێرەدا ئەمرۆ هەندێك هەن خۆیان بە کەمالییەکان ناوزەد دەکەن، کەچی نکۆڵی لەو لایەنە سەربەخۆخوازییە و ئەو دوو هاوپەیمانێتییە دەکەن. ئەگەر ئەو دوو هاوپەیمانێتییەمان لە حیساباتەکان دەرخست چ لە کەمالیزمدا دەمینێتەوە...؟ هیچ شتێك نامێنێتەوە، تەنیا دروشمی نازییەکان نەبێ: یەك سەرۆك... یەك دەوڵەت... یەك نەتەوە. ئەمەش نکۆڵیکردنە لە سیاسەتی شەڕی رزگاری نیشتمانی.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەگەر دەتوانی لێمگەڕێ باچەند تیشکێك بخەمە سەر ئەو بابەتە. ئەمە راستە، ئەو قۆناخەی تا ساڵی 1925 درێژ دەبێتەوە...

**میهری بەللی:** رێم بدە ئەو بابەتە کۆتایی پێبهێنم.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** کەواتە فەرموو.

**میهری بەللی:** دروشمی بەناو بانگی هیتلەر:"یەك نەتەوە، یەك دەوڵەت، یەك سەرۆك" واتە تواندنەوەی بەزۆر. لەکوێ؟! ئەگەر ئەمە ئەڵمانیا بێت دەبێت، چونکە زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی ئەڵمانین. بەڵام هەوڵدەدەن ئەمە لە ئەنادۆڵ جێبەجێ بکەن کە بە مۆزاییکی گەلان و دەروازەی نەتەوەکان دەناسرێت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەمە راگەیاندنی دەستپێکردنی قۆناخێکی تاوانکارانەی خوێناویە، بەڵام دەرئەنجام، سفری لای چەپە.

**میهری بەللی:** بەڵێ سفری لای چەپ، بەڵام لەمیانەی تاوتوێ کردنی کەمالیزمدا نابێ بەتەنیا سیاسەتی هاوپەیمانێتی هەڵبسەنگێنین کە لەکاتی شەڕی رزگاریدا پەیڕەوی لێکردووە، مسۆگەر دەبێ سیاسەتی تواندنەوەی بەزۆریش هەڵبسەنگێنین و دادگایی بکەین کە دواتر پەیڕەوی لێکرد و دەرەنجامێکی زۆر خراپی لێکەوتەوە و تەواو لەگەڵ واقیعی ئەنادۆڵدا ناکۆك بوو، ئەگەرچی لەگەڵ واقیعی ئەوروپادا دەگونجا. بەردەوامبوونی 14 ساڵ شەڕ باشترین بەڵگەیە بۆ ئیفلاسبوونی ئەو سیاسەتە، ئەوانەی خاوەن لە کەمالیزم دەردەکەون، بەتایبەتی لایەنە پۆزەتیفەکەی کە لە بەرامبەر مێژوودا بەتاقیکردنەوەیەکی سەرکەوتووانە دەرباز بوو، هەروەها ئەو سیاسەتانەی پەیڕەوی لێکرد و شوێنگرتنی شەڕی رزگاری لە جیهاندا لێکەوتەوە ـ لە قۆناخی شەڕی شۆڕشگێڕییدا ـ لە هەمانکاتدا لێیان دەخوازرێ کە هاوپەیمانێتی کورد ــ تورك کە لەسەر بنچینەی یەکسانی بونیادنرابوو، بخەنە روو، هەروەها دادگایی ئەو سیاسەتانەش بکەن کە ئیفلاسی هێناوە. بەڵێ با کورد و تورك بین، بەڵام نابێ بەزمانێك قسە بکەین کە لەگەڵ ئامانجی یەکێتی ئازادانە ناکۆك بێت، دەمەوێ جەخت لەسەر ئەمە بکەمەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان**: بێگومان دەبێ ئەو بیروبۆچوونە چەوتانەی سەبارەت بەو ماوەیەی کە گفتوگۆ دەوروژێنی، راست بکرێنەوە. بەهەمان رشتبوونەوە دەبێ بەرگری لەو بیروبۆچوونانەش بکرێ کە دەبێ نوێنەرایەتی بکات، ئەو باوەڕییەی کە لای ئەو زاڵە ئەوەیەکە رۆحی کوردان لەسەر پێکهێنانی کۆماری تورکیا رەنگی نەداوەتەوە.

لەوانەیە بڵێن:" مستەفا کەمال سەرەتا پەسندی کردووە، پاشان دەستبەداری بووە". بەگوێرەی ئەو بیروبۆچوونە ئەمە دوو قۆناخی جیاوازن. بۆچی کوردان لەماوەی دوای ئەو قۆناخە یاخی بوون..؟ ئەمەش ماوەیەکی دیکەی جیاوازە. لەسەرەتا پەسندکردنی شتێکی خراپ نەبوو، بەڵام یاخیبوون و بەرەنگاربوونەوەی دوایشیان شتێکی خراپ نەبوو. لەسەرەتادا دەسەڵات بەدەستهێنان لەسەر بنچینەی برایەتی بوو و ئەمەش شتێکی باش بوو، بەتایبەتی لەساڵی 1920دا، بەڵام دواتر کە لە کۆماریان روانی بینیان هەبوونیان پەسندناکات، بەتایبەتی لەنێوان ساڵانی 1924 ـ 1925دا، ئەوکاتە بەسەرۆکایەتی شێخ سەعید سەرهەڵدان دەستپێدەکات، لەوانەیە هەڵوێستی ئایدیۆلۆژی و سیاسی هاوچەرخانەی نەبووبێت، بەڵام لەبەرامبەر ئەوەدا هێرشە شۆڤێنیستیەکانی دەوڵەتیش دەستی پێکردبوو، کە مۆرکێکی بۆرژوازییانەی وەردەگرت، وەك ئێوەش ئاماژەتان پێکرد تا دواڕادە هێرشی مەترسیدار بوون.

لەوانەیە هەندێك بپرسن: بۆچی بەمجۆرە روویدا..؟ ئەگەر باش لەمەسەلەکان بکۆڵینەوە ئەو تابلۆیەی خوارەوەمان بەروونی بۆ دیار دەبێت: هەر لەگەڵ دروستبوونی چینێکی سەروو لە تراکیا لەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقی، خۆی لە شێوەی دەوڵەتێکی ناوەندی دەرەبەگایەتی رێکخست و تورکمانە هەژارەکانی سەرکوتکرد، ئەوانیش ناچاربوون بۆ ماوەی سەدان ساڵ لە چیاکاندا خۆیان حەشار بدەن و بە ئایدیۆلۆژیا و کولتوورێکی دارشتراوی نوێوە بەردەوامیان بە گوزەرانی خۆیاندا. هەمانشت لە ساڵی 1920یش روویدا. ئەم جارەیان چینی دەسەڵاتداری دەرەبەگی تورك جلی خۆی گۆڕی و جلێکی نوێی بۆرژوازی پۆشی. ئەمە لەسەر رێکخستنی کۆماریش کاریگەری خۆی کرد، کاتێك هەوڵیدا سەرلەنوێ بێتەوە سەر شانۆی مێژوو. لەسەرەتادا لاوازبوو و، بینی کە زۆر پێویستی بە هاوپەیمانێتی بەلشەفێك و کوردەکان هەیە. پێشەنگەکانی چینی بۆرژوازی ئەمەیان وەك هەنگاوێکی تاکتیکی ئەنجامدا. لەم رووەوە مستەفا کەمال لەسەردەمی هاوپەیمانێتییەکاندا نموونەیەکی بەرچاوە و خاوەنی تاکتیکێکی لێهاتووە. بەڵام وەك دەزانن کاتێك کاری پێ نەما هێرشێکی درندانەی بۆ سەر

کۆمۆنیستەکان دەستپێکرد، کە لەگەڵ هاتنی ساڵی 1927دا تاڕادەیەکی زۆر پاکتاوبوون.

**میهری بەللی:** هەروەها هەڵسا بە پاکتاوکردنی نزیکترین هەڤاڵی خۆی.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ ئەمە راستە، من دێمە سەر باسی ئەو خاڵەش. هەڵبەتە بەمە دەخوازن ئاماژە بەسروشتی دژبە دیموکراسیانە بکەن. نەك هەر تەنیا کۆمۆنیستەکان، بەڵکو "فیرقەی تەرەقی نیشتمان"یش خاوەن سروشتێکی لیبرالییانەیە و هەبوونیان پێداویستییەك بوو لە پێداویستییە دیموکراسییەکان.

**میهری بەللی:** بێگومان... بێگومان ئەوانە نوێنەرایەتی رکەبەری راستڕەو دەکەن.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەگەر دەرفەت بدرایە ئەوا کۆمار بەرەو کۆمارێکی دیموکراسی دەگۆڕا، هەروەها فیرقەی ئازادیش ئەگەر کەش و هەوا لەباربووایە پالێوراو بوو بۆ دیموکراتی بوون.

**میهری بەللی:** ئایا بارودۆخ بۆ ئەمە لەبار بوو...؟ ئایا سیستەمی فرەحیزبی لە ساڵانی دوای ئەمە چۆن بوو؟.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** دێمە سەر باسی ئەوەش. ئەوا لەبری دیکتاتۆریەتی تاك حیزبی پێشکەوتنێکی وێکچووی دیموکراسییەت بەدیدەهات، نامەوێ بکەومە ناو دەمەتەقێیەکی بێ واتای وەك: ئایا کات بۆ ئەمە گونجاو بوو یاخود نا؟ بەڵام وەك روون و ئاشکرایە مستەفا کەمال پێوانەکانی زۆر دەرباز کرد. پەلکێش کردنی عەلی فوئاد جەبەسۆی و فەرماندەی پایە بەرزی وەك کازم قەرەبەکر و رەئفەت بەگ و چەندین کەسێتی دیکە کە رۆڵیان لەگەشانەوەی ئەستێرەی مستەفا کەمال هەبوو، لەلایەن خودی مستەفا کەمالەوە بۆ دادگا، سەرچاوەی خۆی لەمەیلی دیکتاتۆریانە و سروشتی دژە دیموکراسیانەیەوە وەردەگرێت، چەوسانەوەیان پێویست نەبوو، ئەمە لە کاتێکدا ئەوانیش بەڕادەی مستەفا کەمال بەشداریان لە رزگاری نیشتمانی کردبوو.

**میهری بەللی:** ئەوانە پەیوەستداری رزگاریخوازی بوون.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەوانە کەسێتی پەیوەستدار بوون و بەشداری جددیان پێشکەش کردووە.

**میهری بەللی:** "ترابزۆنلی"یش واتە "مستەفا سوبحی"یش لەو جۆرە توێژە بوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** بەڵێ...! چەندین کادیری ئیتحاد و تەرەقیش هەبوون، وەك دەزانن ئەوانیش رۆڵێکی کاریگەریان لە بونیادنانی "هێزی نەتەوەیی"دا گێڕا.

**میهری بەللی:** ئەوانە نوێنەرایەتی یەك رێکخستنیان دەکرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** بەڵێ، یەك رێکخستنن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەموویانی لە سێدارەدا، ئەمە لە کاتێکدا هیچ یەکێکیان تاوانێکی ئەوتۆیان نەکردبوو کە لە سێدارە بدرێن. بەسیناریۆیەکی هەڵبەستراوی هەوڵی کوشتن هەموویانی پاکتاوکرد. دەبێ ئەوشمان لەیاد نەچێ کە کوردەکانیشی لەسێدارە دەدا. ئەوەی لێرەدا مایەی سەرنج راکێشانە مستەفا کەمال هەر کەسێکی لەسێدارە دەدا کە دەکرێ ببێتە مەترسییەك لەسەری، ئیدی نەك هەر کوردەکان یاخود کۆمۆنیستەکان بەرماوەکانی سوڵتانیش کە لەناوەرۆکدا سەرهەڵدانی ئیسلامی بوون، تەنانەت ئەگەر نزیکترین هاورێشی بێت. ئەمەش قۆناخی گواستنەوە بوو بەرەو دیکتاتۆرییەتی تاکە کەسی یاخود دیکتاتۆرییەتی بۆژوازی. تادەگاتە ئەو رادەیەی کە "ئەدهەم چەرکەسی"یش بخزێنێتە نێو هەلۆێستی دژوار و ناهەمواری ئەوتۆ کە ناچار بێت رابکات، سەرەڕای ئەوەی لە هەموو کەسێك زیاتر هاوکاری مستەفا کەمالی کردبوو. ئەمە قۆناخێکی زۆر سەرسوورهێنەرە. من وای بەراست دەزانم کە هۆکاری گشت ئەو رووداوانە بۆ سروشت و کارەکتەری بۆژوازی تورکی بگەرێنرێتەوە. بەهەڵەدا ناچین ئەگەر بڵێین: دوای ئەوەی بۆرژوازی تورکی شوێن پێی خۆی قایم دەکات پاکتاوی ئەوانە دەکات کە لە رۆژگاری تەنگەتاویدا هاوپەیمانێتیان لەگەڵدا کردووە.

**میهری بەللی:** ئەمە تەواو راستە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** هەر وایە.

**میهری بەللی:** کوشتوونیەتی.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** بێگومان، ئەمە راستیەکی بەڵگەنەویستە، مستەفا کەمال لەسەرەتای سەردەمی خۆیدا باوەڕی بەپێویستی سازدانی هەوپەیمانێتیەکان هەبوو و لەم رووەوە ئەگەر راست کاریشی کردبێت، بەڵام مستەفا کەمال خۆشی لە قۆناخی دواتردا و بەتایبەتی دوای شوێن پێ قایم کردنی خۆی نزیکترین هاورێکانی و گشت رێکخستنە سیاسیەکانی دیکەی پاکتاو کردووە، ئەمە راستیەکی بەڵگە نەویستە و پەیوەستە بە مەیلی بۆرژوازیەوە.

**میهری بەللی:** بەڵام دەرئەنجامەکان روون و ئاشکران، دەرئەنجامی ئەوەی یەکەم سەرکەوتن بوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەمە زۆر سروشتیە.

**میهری بەللی:** کە سەرکەوتن بوو لە شەڕی سەربەخۆیی و ئەمەش بەرهەمی هاوپەیمانێتیەکان بوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لە دەرئەنجامی دووەمیدا...

**میهری بەللی:** بووە هۆی بن کەوتن، نەگەیشتە ئاستێکی هاوچەرخانەی شارستانی.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەمە سەرچاوەی ئەو کێشانەیە کە لە ڕۆژگاری ئەمرۆدا تورکیا پێوەی دەتلێتەوە، ئەم مەسەلەیەی ئێستا باسی لێوە دەکەم، لە ڕاستیدا هەر لەساڵی 1925وە و دەستپێکردنی مستەفا کەمال بە پاکتاوکردنی کۆمۆنیستەکان و هاوڕێ نزیکەکانی و داپڵۆسینی بێ بەزەییانەی کوردان گەوهەری ئەو قەیران و گرێ کوێرەیە پێکدێنێ کە ئەمڕۆ تورکیا پێوەی دەناڵێنێ. دەمەوێ لەم ڕاستیە تیبگەن، یاخود....

**میهری بەللی:** نەدەبوایە بەشداری لەم جۆرە کارە بکردایە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** دێمە سەر باسکردنی ئەم خاڵەش، بەڵام سەرەتا دەخوازم ئاماژە بەوە بکەم کە قۆناخی یەکەم سەرکەوتنی لەگەڵ خۆیدا هێنا، کەچی قۆناخی دووەم بووە سەرەتای دەرکەوتنی کێشەکان.

**میهری بەللی:** ئەمە ڕاستە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بانگهێشتی ڕۆشنبیران و تەنانەت ئەفسەرە تورکەکانیش دەکەم کە جیاوازی لەنێوان ئەم دوو قۆناخە بکەن.

**میهری بەللی:** بێگومان ئەم ڕوونکردنەوەیە لەشوێنی خۆیدایە، دەبێ کەمالیستە ڕاستەقینەکان...

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ڕاستەقینە و ناڕاستەقینە بەلامەوە گرنگ نییە، گرنگ دیتنی جیاوازی نێوان ئەو دوو قۆناخەیە. من دوژمنی سەرەڕۆی کەمالیزم نیم. هەرگیز دەستبەداری شیکردنەوەی زانستیانە نابم و لێی پاشگەز نابمەوە ئەمە هەر لەسەرەتاوە تێڕوانینی من بووە. وەك ئێوە دەزانن ئەو مەسەلانە لەلای هەر کەسایەتیەك کە وەرچەخان ئەنجامبدات لە ئارادایە، قۆناخی یەکەم پۆزەتیف پێشکەوتووە، کەچی ئەوەی دووەم تەواو کۆنەپەرستانەیە.

**میهری بەللی:** ئەمەش گەوهەری کێشەکەیە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بێگومان ئەمە گەوهەرەکەیەتی، ئێمە قۆناخی یەکەم بەپۆزەتیف دادەنێین و خاوەنداری لێدەکەین، بەڵام ئەوەی دووەم نێگەتیفانەیە و ڕەخنەی دەکەین. ئەمە هیچ پەیوەندی بە ناوزڕاندنی بزاڤی ڕزگاری نیشمانی تورکیا و، یاخود پشتیوانی کردنی شۆڤێنیزم نییە.

**میهری بەللی:** ناپلیۆن سەرکردەی سەرکەوتووی شۆڕشی فەرەنسایە و هەر خۆشی دواتر یەکەم کۆماری رووخاند و ئیمپراتۆریەتی ئاواکرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەمە تەواو راستە و مێژوو پڕە لە کەسێتی بەم جۆرە، ئەمە ئەو خاڵەیە کە دەمەوێ ئاماژەی پێبکەم و جەخت لەسەر چۆنیەتی گردبوونەوەی کێشەکانی تورکیا بکەم. وەك ئێوەش ئاماژەتان پێکرد، هەر لەوکاتەوەی مستەفا کەمال برافی کۆمۆنیزمی داپلۆساند و زەبرێکی کوشندەی لە برافی جووتیاران وەشاند و سروشتی دژە دیموکراسیانە تا دوارادە پێشکەوت، بەڵام دوای داپلۆساندنی کوردان شۆڤێنیزم گەشەیسەند، دوای باڵا دەستی تاکە پارتی دیکاتۆریەتیش خۆی تۆکمە کرد، ئەمەش بووە هۆی گردبوونەوەی، زیاتری کێشەکان. لەگەڵ....

**میهری بەللی:** ئەمەش سازشی لەگەڵ خۆیدا هێنا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لێرە پێویستە بەشێوەیەکی تایبەت ئاماژە بەتایبەتمەندیەکانی هیتلەر و مۆسۆلینی و تا رادەیەکیش ستالین و ئەو شێوازانەی کە تاك حیزبێتی CHP بەرجەستەی کردبوو بکرێ. پێم وایە گۆڕانی CHP بۆ حیزبێکی فاشیست پەیوەستە بەو ساڵانەوە. لە راستیدا یەکەم گروپی پەرلەمان دیموکراسیخوازبوون، بەڵام دواتر کە CHP وەك تاکە حیزب باڵادەست دەبێت، دەبێتە ناوێك بۆ هەڵوەشاندە و داڕزاندن، لە هەمانکاتدا هێدی هێدی دەبێتە ئامرازێکی دیکتاتۆریەت و گردبوونەوەی کێشەکان. لە (فیرقەی سەربەست) بڕوانن، هەروەها بڕواننە ئەزموونی (DP) پارتی دیموکرات لە قۆناخی دواتردا... ئەگەر لایەنی دیکتاتۆری زێدە نەبووایە، ئەوا لەلایەن جەماوەری گەلەوە پشتیوانی زۆری لێنەدەکرا. ئەم قسانەم بەواتای خراپ باسکردنی کۆمار و تایبەتمەندییە رزگاریخوازیەکەی نایەت، من راشکاوانە ئاماژەم بەلایەنە پۆزەتیفەکانی کردووە. بەڵام نابێ ئەوەمان لە یادبچێت کە هەمان کۆمار لە قۆناخەکانی دواتردا بۆ دیکاتۆریەت دەگۆڕێت و دەبێتە سەرچاوەی گردبوونەوەی کێشەکان و هۆکاری داڕوخان و داڕزان.

**میهری بەللی:** بەڵام دەبێ وریابین و ئێمەش...

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لێم گەڕێ با سەرەتا مەسەلەکە راڤە بکەم، پاشان سەرەنجی خۆت بخەڕوو. دەربازکردنی ئەو چەوساندنەوە و داپلۆساندنە دژوارە تەنیا دەکرا لەمیانی پیادەکردنی یەك لەو دوو شێوازانە بەدی هاتبا ئەگەر رێبەرایەتیەکی کۆمۆنیستی یاخود دیموکراسی سۆسیالیستی راستەقینە هەبووایە وەك ئەوەی لە (چین) روویدا، ئەوا قۆناخێکی شۆڕشی دیموکراسی مەزن دەستپێدەکرا بۆ رووبەڕوونەوەی گۆڕانی دەسەڵات بۆ شێوازی "شین

کـای شـیك". بـەڵام پێشـکەوتنی بـەم جـۆرە روویـنـەدا و کۆمۆنیسـتەکان داپلۆسێنران. شێوازی دووەم: خۆی لـە هەڵگێرسـاندنی شۆڕشـێکی دیموکراسـی دەبینێتـەوە، بـەڵام وەك ئێـوەش دەزانـن "ئەدهـەم چـەرکەس" و ئـەزموونی (فیرقەی سەربەست) دووچاری پاکتاوبوون هات، بەرلەوەی پێشکەوتنێکی بـەم جـۆرە رووبـدات، ئەمـەش لەگـەڵ خۆیـدا رەوتـی وەرچـەرخانی بـەرەو حکومـەتێکی دیکتـاتۆری لـە شـێوەی "شـین کـای شـیك" گەشـەی کـرد. لەبەرئـەوەی رێبەرایەتیـەك لەشـێوەی رێبەرایـەتی (مـاو) دەرنەکـەوت، ئـەوا بزاڤەکە دووچاری هەرەس هێنان بۆوە و کەوتە دەست رەوتێکی راسترەوانەتر هەرگیز بەرەوتێکی لیبرالی ناوزەدیان ناکـەم ئـەم رەوتـە هێـدی هێـدی لەگـەڵ دەرەبەگە خاوەن موڵکەکان؛ ئەوانەی بونیادی چینێکی کۆنەپەرست پێکدێنن، هاوپەیمانێتی بەست. لە راستیدا بزاڤ و پێهەڵگرتنی پارتی دیموکراسی بزاڤێك بوو لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا پشتی بەدەرەبەگ دەبەست، ئەمـەش بـەو واتایـە دێت کە بزاڤێك بوو بنەمایەکی چینایەتی کۆنەپەرستانەی هـەبوو. بـەڵام لـە هەمانکاتدا لەبەرئەوەی لەدژی مەیلە دیکتاتۆریەکان بوو، ئەوا لەیـەك ئاسـتدا پشتیوانی راسترەو و چەپڕەوەکانی بەدەستهێنا، ئێوە باش دەزانن پێهـەڵگرتنی "جـەلال بـەیار" و "عـەدنان مەنـدەرس" بەتایبـەتی پێشـکەوتنەکانی ساڵی 1946 لەلایەن گەلەوە پشتیوانیەکی بەرچاویان لێکـرا. بـەڵام ئـەم پشـتیوانی کردنـە کۆنەپەرسـتی سـەرکردایەتی ئـەو پێهەڵگرتنـە رەتناکاتـەوە. دەبـێ بەشـێوەیەکی بـاش جیـاوازی لـەنێوان ئـەو دوو تایبەتمەندێتیـە بکرێـت. بەئەنـدازەی خەتـەرناکی ئـەو لایەنـە لـەڕادە بـەدەرەی دیکتاتۆریـەتی لـەو ساڵانەدا و لایەنی کۆنەپەرستانەی و گەیشتنی بەڕادەی شێوازەکەی (شین کـای شـیك)، ئـەوا بەهـەمان ئەنـدازە ئـەو ئۆپۆزیسیۆنەی کـە پشـتی بـە دەرەبەگـە موڵکدارەکان دەبەست کۆنەپەرست و خەتەرناکە، بەڵام تا رادەیـەکیش لایـەنی پۆزەتیفانـەی هـەبوو، ئەمـەش بـەهۆی ئـەو پشـتیوانیەوە بـوو کـە گـەل لێـی دەکرد، ئەمە بوو پارتی دیموکراسی (DP).

هەروەك چۆن پشتگیری کردنەکەی گەل بەواتای خودی پـارتی دیموکراسـی نایـەت، بەهـەمان شـێوەش نـابێ چاوپۆشـی لەسروشـتی چـینایەتی کۆنەپەرسـتانەی سەرکردایەتیەکەشـی بکرێـت. بـەڵام لەلایـەکی دیکـەوە هەڵوەشـانەوە و داڕووخـان و داڕزانـی بەسـەر CHP و بەتایبـەت "ئینۆنـو" داسـەپاند و وایلێکـرد هـیچ پەیوەندیـەکی بەپێشـکەوتن خوازیـەوە نـەمێنێ، لەوەش خراپتر هەر جموجۆڵێکی سادەی کۆمۆنیستی بەو پەڕی توندوتیژیەوە دادەپلۆسێ و لە 1940یشدا پەیوەندی و پاشکۆیەتی خۆی بۆ هیتلـەر پتـەو و تۆکمە کرد. واتە وەك ئێوەش باش دەزانـن حکومـەتێکی تـەواو فاشیست بـوو،

وەك ئـەو هێـزە چینایەتیەی کـە مەیلـداری ژاپـۆن بـوو و وەك ئـەو گروپـە فاشیستەی کە پشتیوانی لـە هیتلـەر دەکـرد و لـە دەسەڵاتیشدا بەشداربووە و هەموو هەوڵێکی بۆ داپڵۆسینی کۆمۆنیستەکان بوو.

بـەو واتایـە قەڵەمبازەکـەی پـارتی دیمـوکرات بەسـەرکەوتنێکی بـەرەی ئینگلیـزی ـــ ئـەمریکی دادەنرێـت. زۆر بەداخـەوە بزاڤـی کۆمۆنیسـتی لەگەیشتنی بەسەرکردایەتیەکی بەهێز سەرنەکەوت وەکو لە چین و ڤێتنامـدا دەرکـەوت، بەهـەمان شێوە لەبیسـتەکاندا لـەتورکیاش بـەو شێوەیە روویـدا. هۆکارەکانی ئەمە زۆرن، کە نۆرەی هات گفتوگۆی لەسەر دەکەین. وەك ئێوەش دەزانـن لەگـەڵ دەسـتپێکردنی سـەردەمی پـارتی دیموکراسـی وەرچـەرخانی بۆرژوازی بیرۆکراسی یاخود بۆرژوازی بیرۆکراسیانەی سەرمایەداری مۆنۆپۆلی دەوڵەت بەبەراود لەگـەڵ دەرەبەگـە مۆڵکدارەکان ئەوانـەی بـۆ سـەرمایەدارانی زەوی و زار وەرچـەرخان، دەسـتی بەپاشەکشـە کـرد. بێگومـان وەك ئێـوەش چـەندین جـار جـەختتان لەسـەری کردۆتـەوە ئەمـە هـیچ پەیوەندیـەکی بـە دیموکراسـیەتەوە نییـە. ئەمـە نـەك پێشـکەوتنێکی دیموکراسـیانەیە، بـەڵکو کۆنەپەرستانەیە. من لەم رووەوە لەگەڵ ئێوەدا هاوبیرم.

**میهری بـەللی:** لـێم گـەڕێ بـا ئـەم بابەتـە کـەمێك شرۆڤە بکـەم. سـەرەتا پێویستە ئاماژە بەوە بکرێ کە مێژووی هاوچـەرخمان پـڕە لـەو کێشانەی کـە لەئەنجامی کودەتـا سـڤیل و سـەربازیەکانەوە دەرکـەوتوون. بـا ئـەم مەسـەلەیە هـەر لــە سـەرەتاوە تـاوتوێ بکـەین. هـەر بـۆ نموونـە لـەمیانی کودەتـا سـەربازیەکاندا لـە سـەدەی 19دا (وەڤـاس ڤـەللی) هەیـە. ئـەو رەوشـەی کـە "عەبدول عەزیز" دووچاری بـوو خـۆی لەخۆیـدا کودەتایەکە، یـاخود راسـتر بڵـێین هەوڵـدانێکی کودەتایانەیـە بـۆ سـەروبن کردنـی دەسـەڵات، لـە پێنـاوی ئەوەی بەرژێمێکی پێشکەوتووتر بگەن، بەڵام ئەنجامگیرنەبوو بۆیە دوای ئەوە سـەردەمی "عەبـدول حەمیـد" دەسـت پێـدەکات، کـە بەسـەردەمێکی ئۆتۆکراسـیانە دادەنرێـت. هەوڵدانـەکانی وەڤـاس ڤـەللی هەوڵـدانێکی کودەتاییانـەی سـەربازییە. هـەروەها شۆڕشـی 1908 هەیـە کـە "لیـنین" بـە شۆڕشێکی بۆرژوازی ناوزەدی کردووە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** مەشروتیەت، کە مۆرکی سەربازیانەی بەسەردا زاڵبوو.

**میهری بەللی:** لەوێشدا مۆرکی سەربازی زاڵە، لەجێگەی عەبـدول حەمیـد دەسەڵاتێکی سەربازی هات.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** مستەفا کەمال لە بزوتنەوەدا بوو.

**میهری بەللی:** مستەفا کەمال لە پلەی دووەم دا بوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** نا. نا.....

**میهری بەللی:** تەنانەت لەپلەی سێیەم دا دێت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** بەڵكو لەمەش بەدواوەتر.

**میهری بەللی:** لێرەدا شەڕی رزگاریخوازیش هەیە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەویش شۆڕشێكە مۆركی سەربازیانەی بەسەردا زاڵە.

**میهری بەللی:** بەڕاستی ئەویش وایە. بەدواییدا سیستەمێكی دیكتاتۆری سەربازی دادەمەزرێ و سەرۆك كۆمارەكەشی مستەفا كەمال پاشایە و سەرۆك وەزیرانەكەشی سەرلەشكری بەرەی رۆژئاوا سەرهەنگ (　　) "عصمت بەگ" بوو، سەرۆكی ئەنجوومەنی نوێنەرایەتیەكەشی سەرهەنگی خانەنیشین كراو "كازم ئورباى" بوو و پاشان ئەمینداری گشتی حیزب "رەجەب پەكە" جێی گرتەوە، هەموو ئەوانە سەرباز بوون.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** بەڵێ هەموویان سەربازبوون.

**میهری بەللی:** بەڵام توركیا ئەوكاتە بەشێوەیەك لە شێوەكان سەربەخۆیی خۆی لە دەرەوە بەدەست هێنابوو و تا رادەیەكیش بەئارامی گەیشتبوو. ئیدی بۆرژوازی مشەخۆر دروست دەبوو و لەسالانی جەنگی دووەمی جیهانیدا خۆی بەهێز كردبوو، ئەوەش لەمیانی بالادەست بوون بەسەر بازاڕی رەش بەدیهات، كە بەهۆی لە پەلوپۆكەوتنی بازرگانی دەرەوە بەرفراوان ببوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەوەشی دەخەمە سەر، دەستی بەسەر سەروەت و سامانی كەمەنەتەوەكاندا گرت.

**میهری بەللی:** دەستی بەسەر زەوی و زار و سەروەت و سامانی ئەرمەنیەكاندا گرت، دوای ئەو شالاوی بەزۆر كۆچبەری كردنەی دووچاری هاتن. دوای شەڕی رزگاریش توێژێكی بۆرژوازی لەئەنجامی دەست بەسەراگرتنی سەروەت و سامان و پڕۆژەكانی نزیكەی دوو میلۆن ئەرمەنی كە ناچاربوون بۆ یۆنان كۆچ بكەن، دروست بوو. لێرەدا دەبێ باجی (لەپێناو مانەوە لە ژیاندا) لەیاد نەكەین، كە لە سەردەمی حكومەتی CHPو بەتایبەتی دوای سەركەوتنی هیتلەر بەسەر كەمەنەتەوەكاندا سەپێنرا. بە راستی بۆرژوازیەكی تالانكار و دەستدرێژیكار بوو. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەو قازانجە زۆر و زەبەندە بكرێ كە دەرەبەگە موڵكدارەكان لەئەنجامی بەرزبوونەوەی نرخی دانەوێڵە بۆ دەیان قاتی خۆی لە سالانی شەڕدا، بە دەستیان هێنابوو. لەپشت ئەمەوە چینێكی دیاریكراو لە ئارادانەبوو، بەڵكو چەند توێژێكی دەرەبەگی موڵكدار و ئەوانەی بەبازرگانیەوە سەرقاڵ بوون هەبوون كە گشتیان لەنێو ریزەكانی CHP لەژێر ناوی ئۆپۆزیسیۆنی گەلێری دەركەوتن.... یەكێكیان پلەی سەرۆك وەزیران و ئەوەی دیكەش ئەركی

(موفەتیشی) حیزب و ئەوەی سێهەمیشیان پلەی دادوەری (قازی) دادگای سەربەخۆیی وەرگرت.

**عەبدوللا نۆچ نالان:** واتە بەرزترین کەسێتیەکانیان.

**میهری بەللی:** ئەوانە ڕێبەری ئۆپۆزیسیۆنی سڤیل بوون، لەساڵی 1946دا لەنێوان دوو لەمانە ڕکەبەریەکی جددی هاتە ئاراوە. یەکێکیان دەیووت (ئێمە وەك چەپرەو یان لە زیندان یان لە تاراوگە ژیان بەسەر دەبەین) ئەو ڕکەبەریە گەیشتە ململانێیەکی سیاسی توندوتیژ، بەو ئومێدەی زۆرترین سازش پێشکەش بە ئیمپریالیزم بکەن و گڵۆپی سوور بۆ دوو رووەکان داگیرسێنن. سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران (شەمسەدین ئۆرگونات) بە ئەندامێکی CHPی ووت:"من ئەوەندە خوێندنگای شەریعەتم کردۆتەوە. لە کۆتاییدا DP لەم ڕکەبەریە بەسەرکەوتوویی دەرکەوت. هەرچیەك دەبێت بابێت ئەوەندە بۆ CHP بەسە کە شەڕی ڕزگاریخوازی بەڕێوەبرد و پێشەنگایەتی قۆناخی کەمالیزمی کرد و دەروازەی دەسەڵاتی بۆ هەڵبژاردنەکان خستە سەرپشت. بەڵام چ پێشکەوتنێکی دیموکراسیانەی بەدیهێنا؟

**عەبدوللا نۆچ نالان:** مسۆگەر شۆڕشێکی دیموکراسی نییە.

**میهری بەللی:** هەڵبەتە وەها نییە، بەڵام بۆ؟ دەبا بڕوانینە هەردوو ماددەی 141، 142 کە بۆ کۆمۆنیستەکان دارێژرابوو و لەساڵی 1936 پەسندکران و بریتین لە سزادانی (6) مانگ زیندانی کردنی بۆ هەرکەسێك کە تەنیا کاری پڕوپاگەندەیی بکات.

**عەبدوللا نۆچ نالان:** ئەم دوو ماددەیە لە مۆسۆلینیەوە وەرگیراوە.

**میهری بەللی:** بەڵێ لە مۆسۆلینیەوە وەرگیراوە بە (6) مانگ زیندانی کردنی بۆ سزای کاری پروپاگەندەیی دەستپێدەکات و دووساڵیش بۆ کادیرێکی سەرکردایەتی. هەر لە ساڵی 1946وە کار بەو دوو ماددەیە کرا. دووساڵ سزای زیندانم بەسەردا سەپێنرا تەنیا لەبەرئەوەی کادیرێکی سەرکردایەتی (یەکێتی لاوان بووم)، دوای گەیشتن بەفرە حیزبی لەساڵی 1946دا ئەم سزایە چەندین قات زێدەبوو، لەساڵی 1951دا ماددەی 141یشی پێوەلکێنرا کە بریتییە لە: سزای لە سێدارەدان، ئەمە لە سەردەمی ئەنجوومەنی نوێنەرایەتی دابوو کەDP زۆربەی کورسیەکانی بەدەستهێنابوو.

**عەبدوللا نۆچ نالان:** ئەمە ئاماژە یەکە بۆ رادەی توندوتیژی.

**میهری بەللی:** ئایا ئەمە پێشکەوتنێکی دیموکراسی بوو؟

**عەبدوللا نۆچ نالان:** نەخێر.

**میهری بەللی:** ئەمەبوو فرە حیزبایەتیەکەیان.... ئەوەی تا ئێستا زانراوە لە دەوڵەتانی دیکە، بەتایبەتی لە رۆژئاواوە سیستەم دوای بەدیهێنانی شۆڕشێکی گەلێری دێتە کایەوە و وەك قۆناخێکی گواستنەوەیە بۆ دیموکراسی، دیموکراسیەت واتە ئازادی رێکخستن بۆ گشت چین و توێژە نەتەوەییەکان و بەناسنامە و سروشتی چینایەتی خۆی بەشداری لەسیاسەت دەکات، ئەوەی کە لە تورکیا رووینەدا ئەمەبوو. بەڵکو تەواو پێم وانەبوو، وەك بڵێی یاساکانی فاشیزم تێری نەدەکرد سزاکانیان بۆ چوارقات زێدەکرد. ئەمە جگە لە پێشکەوتنێکی دژە دیموکراسی و شۆڕشی چەواشە هیچی دیکە نییە. لە هەمان قۆناخدا دەروازەکانی تورکیا بۆ ئەمریکا خرایە سەرپشت. لەمیانی ئەو (10)ساڵەدا بنکە ئەمریکیەکان کە موشەکی نووك ئەتۆمیان تێدا بوو گشت تورکیای تەنیەوە، ئەمەش بەواتای لەدەستدانی ئەو دەسکەوتانە بوو کە لە میانی شەڕی رزگاریخوازیدا بەدەست هێنرابوو.

**عەبدوڵلا نۆچ ئالان:** هەروەها خۆ خزاندن بوو بۆ ژێر کاریگەری و بالادەستی ئیمپریالیزم.

**میهری بەللی:** تەنانەت دادۆشێکی راستەوخۆی ئازادی بوو، ئەمەش خۆی لەخۆیدا پێشکەوتنێکی شۆڕشی چەواشەبوو. هەربۆیە ئەوکاتە دەمان ووت:"شۆڕشێکی چەواشەی دژی کەمالیزمە، ئەمەبوو سیستەمی فرە حیزبی لای خۆمان".

**عەبدوڵلا نۆچ ئالان:** بەڕای من ووتەیەکی وەك:"دژی کەمالیزم بوو" ووتەیەکی راست نییە.

**میهری بەللی:** بەلام لەو قۆناخەدا....

**عەبدوڵلا نۆچ ئالان:** دەکرێ بەشۆڕشێکی چەواشە ناوزەدی بکەن.

**میهری بەللی:** بەڵێ شۆڕشێکی چەواشە بوو.

**عەبدوڵلا نۆچ ئالان:** شۆڕشێکی وابوو کە پێویست بە ناوهێنانی کەمالیزم ناکات.

**میهری بەللی:** هەربۆیە لە گەیشتن بەدەسەلاتی گەل (          ) بەرەو پێشەوە چونێك نەبوو.

**عەبدوڵلا نۆچ ئالان:** ئەوەشی بچێتە پاڵ، ناوزەدکردنی بەسیستەمێکی مەدەنی گومان و دەمەتەقێ دەوروژێنێ.

**میهری بەللی:** تەنانەت ئەگەر حکومەتێکی....

**عەبدوڵلا نۆچ ئالان:** بەلام ناتوانین ناوی شۆڕش بەسەر هەموو گواستنەوەیەکی مەدەنی (الانتقال المدنی) دابنێین. رای تۆ چیە ئەگەر بەگروپی سقیل ناوزەدیان بکەین، گروپێکی سقیلی مەیلداری ئیمپریالیزم؟

**میهری بەللی:** مەبەستم ئەوەیە ئەوانەی جڵەوی دەسەڵاتیان گرتەدەست ئەو سەرباز و جەنراڵانە بوون کە دەرچووی خوێندنگا جەنگییەکان نەبوون.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** لێرەدا دەتوانین بەشێوەیەکی روون ئەو جیاوازیەی خوارەوە دیاری بکەین، لەجیاتی دەستەی سەربازی CHP دەکرێ ناوی دەستەی سڤلیان لێبنێین، کە ئەو دەستەیە بەرژەوەندیەکانی بازرگان و موڵکدارەکانی دەخستە پێش بەرژەوەندیەکانی دیکەوە، هەروەها پەیوەندیەکی پتەویشی لەگەڵ ئیمپریالیزم هەیە.

**میهری بەللی:** تەواو وایە.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** ئەمە راستیەکە و پێویست بەگەورەکردنی پرسەکە ناکات. بەڵام سەبارەت بە پشتیوانی گەلێری، ئەمەش مەسەلەیەکی سروشتیە بە بەراورد لەگەڵ ئەو ئێش و ئازارەی گەل لە سەردەستی CHP چێشتیان. ئەو بەشداربوونە گەلێریەی بۆ DP کرا خۆی لەخۆیدا بزاڤێکی دیموکراسی گەلێری بوو، ئەمەش دادۆشینی گەل و لەرێ لابردنی گەل لەلایەنی خودی ئەو دەستەیەوە رەت ناکاتەوە. واتە خیانەتی لە بزاڤی گەلێری کرد. ئەمە جگە لە پڕکردنەوەی زیندانەکان بە کۆمۆنیستەکان و سەپاندنی سزای دژوار و ناڕەوا بەسەریاندا، ئەمە لە کاتێکدا خۆی لەسەرەتا گڵۆپی سەوزی بۆ داگیرساندبوو. ئەوەی لە قۆناخی دواتردا روویدا لە رێ لابردنی بزاڤی گەلێری بوو.

**میهری بەللی:** کێشەیەکی تر ئەمەیە، ئەوانەی کودەتای 27ی ئایاریان بەرپاکرد کێ بوون و چ نیازێکیان هەبوو؟ ئەمە لە کاتێکدا دەبێ ئەوەش لەیادنەکەین کە کودەتای 27ی ئایار ـ لە دەرەوەی ئیرادەی کودەتاکاران ـ دەروازەکانی تورکیای لە بەردەم تەشەنەکردنی چەپڕەویدا کردەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** کودەتاکاران فاشیست بوون، هەندێ توێژی دیکەشیان لەگەڵ دابوو تەنانەت....

**میهری بەللی:** کەمالیستەکانیش بەشداریان تێداکرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** ئەوانەی لە چەپەوە نزیك بوون.

**میهری بەللی:** دواتر لە گوڤارەکەماندا وتارێکمان بەناوی خۆم و سوبحی کەرامات بڵاوکردەوە (خوازیارانی یەکێتی نەتەوە)یش لە گۆڤارەکەی ئێمە دەیانووسی.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** بەڵێ، بەڵام دواتر جودابوونەوە.

**میهری بەللی:** بەڵام ئەوانە تا ئەوکاتەش کەمالیست بوون. بەڵام دوای قەیرانە جددیەکان نەیانتوانی بەرگە بگرن و بوونە سۆسیال دیموکراتێکی

هاوشێوەی ئەوروپا. واتە تورکیا لە سەرووی ئیرادەی ئەوانەوە بۆ چەپ کرایەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** بۆچی؟ چونکە زەمینەی چینایەتی زۆر بەرفراوان ببوو.

**میهری بەللی:** هەروەها ڕەوشی نێودەوڵەتیش گوڕانکاری بەسەر داهاتبوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** لەو ساڵانەدا کرانەوەیەکی مەزن بەسەر بزاڤی رزگاری نیشتمانی و بلۆکی سۆسیالیزم بەدیهاتبوو.

**میهری بەللی:** ئەوکاتە چەندین شۆڕش لە ئارادابوون، شۆڕشی کوبا، شۆڕشی جەزائیر...

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** هەروەها ئەوکاتە شۆڕشی سەرکەوتووی وەك چین و ڤێتنامیش هەبوون.

**میهری بەللی:** بەڕاستی ئەمانە ڕووداوی گەورەبوون. سەرباری ئەوەش ئەزموونی مەزن لە ئارادابوون لەگەڵ ڕەوشی گران و زۆریدا گفتوگۆ لە تورکیادا لەسەر سۆسیالیزم پێش دەکەوت گفتوگۆکان بە تەنها لەسەر ئەم خاڵە بوو. بزاڤی نهێنی کۆمۆنیزم جگە لە پاشماوەکەی هیچی تر لەئارادا نەمابوو، پارتی کرێکاران (T1P) لەلایەن ئەو سەندیکاخوازانەی کە لە رابردوو بۆ نەفرەتکردن لە کۆمۆنیزم ڕێپێوانیان دەکرد، دامەزرا، دوور لە قاڵبوونەوە لە سۆسیالیزم دەستیان بەم کارەکرد. هیچ شتێکیان بەدەست نەهێنا و دووچاری گۆشەگیری بوون، ناچاربوون تەقلی ڕۆشنبیران بن.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ڕۆشنبیرە چەپەکان.

**میهری بەللی:** ڕۆشنبیرە چەپەکان ئەوانەی هەواداری بزاڤی کۆمۆنیزم بوون وەك (بەهیجە بۆران و مەحەمەد عەلی) هەروەها ئەوانەش کە لەدەرهەقیاندا سزایەك دەرنەچووە و توانای کاری سیاسیان بۆ ڕەخسابوو و لە دەرهەقیاندا هیچ بڕیارێکی دەست بەسەریان لەسەر نەبوو. لەمیانی ئەو پێشکەوتنانەدا دەتوانین ریسایەکی گشتی دەربخەین کە بریتیە لە هەرگیز ناکرێ کۆمەڵگاکان بۆ مەدەنی و سەربازی ــ بەتایبەت لەواقیعی تورکیادا ــ پۆلێن بکەین.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** پێچەوانەی ئەمە، دژی ڕاستییە.

**میهری بەللی:** لەچاو پێکەوتنی ئەم دواییەت لەگەڵ تەلەفزیۆندا لەدەرگای خاڵێکی زۆر گرنگت دابوو کە پێویست دەکات زۆرباش تاوتوێ بکرێت. کودەتای فاشیست نەیدەخواست ئەمە ڕوودات. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکە کێ بوو کە نەیدەخواست ئەمە ڕوودات؟ ئەوەی پێویستە بزانین ئەمەیە. لەتێکۆشانی ئێمەدا ئەوەی ئامانجی بەدیهێنانی ژیانێکی ئازاد

لەوڵاتێکی هاوبەش بۆ گەلی کورد ـ تورك لەسەر بنەمای یەکسانی و ئازادی و لەچوارچێوەی یەکێتیدا دەخوازێت، کێیە؟ کێن ئەوانەی لەو شەڕە قرێژەدا نوێنەرایەتی بەرژەوەندی نیشتمانی دەکەن. لێدوانەکانی تۆ لەم رووەوە سەرنج راکێش و وروژێنەرە.

**عەبدوڵڵا نۆچ تالان:** دێمە سەرباسکردنی ئەم خاڵەش، بەلام بەرلەوە، سەرنجێکم هەیە سەبارەت بەوەی لەسەر سالانی (50)کان باستانکرد، من لەو قۆناخەدا پێشکەوتنێکی دیموکراسیانە نابینم، بەڵکو وەك قۆناخێکی دەسەلاتی کۆنەپەرستانەی لەقەڵەم دەدەم.

**میهری بەللی:** ئێمە لەو سالانەدا رۆژگارێك لە زیندان و رۆژگارێکی تریش بەدەست بەسەری لەتاراوگە ژیانمان بەسەربرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ تالان:** دەستەیەکی ئەوتۆ نییە مۆرکی گروپێکی سەربازی لەسەر بێت، بەلام پێشکەوتنخوازی دەستەیەکی سڤیلی بەمجۆرە کە پشت بە دەرەبەگە مولکدار و بازرگانە کۆمپرادۆرەکان ببەستێ، جێی دەمەتەقێ و گفتوگۆیە، لەو باوەڕەشدا نیم کە پێشکەوتووخواز بێت. بەلام سەبارەت بە کودەتای 27ی ئایار ـ راستە ـ لە راستیدا قەڵەمباز و کاردانەوەیەك بوو بۆ وەلامدانەوەی بن بەستبوونەکان، هەڵبەتە ئەوکاتە هاوسەنگییە نێودەوڵەتییەکان و ئەو پێشکەوتنەی کۆمەڵگای تورکیا بەدیهێنابوو لە ئارادابوو، قۆناخێکی پڕ لە ناکۆکی بوو، کاتێك ناکۆکییە ناوخۆیی و دەرەکییەکان بێنینە لای یەك لەکودەتای 27ی ئایار تێدەگەین. بەگوێرەی من لە راستیدا کۆمەڵگای تورکیا سەرەڕای هەمووشتێك ـ لەقۆناخە دژوارەکاندا وەك دینامیکییەتێك دەردەکەوێ. پێموایە فراوانکردنی ئەو بابەتە زیاتر روون دەبێتەوە.

بەداخەوە، کێشە چینایەتی و نەتەوەییەکانی کۆمەڵگای تورکیا بە دینامیکییە کۆمەلایەتییە سڤیلەکان چارەسەر نابێت، واتا بێ هێزن. ئێستاش هێز و دینامیکییەت لەنێو ئەو رێکخستنەدا چڕبۆتەوە، کە دەکرێ بەرێکخراوێکی سەربازی ناوزەدی بکەین و لەکاتە هەستیار و دژوارەکاندا تیایدا بەدوای چارەسەریدا بگەڕێین. ئەمەش راستی مێژوویی تورکیایە. هەر بۆ نموونە؛ پێهەلگرتنی گشت شۆڕشە چەواشەکان و قەڵەمبازە پێشکەوتنخوازەکان لەنێو ئەو رێکخراوە سەربازییەدا پێیان هەلگرتووە، چ لە سەردەمی سەڵتەنەت و چ لە سەردەمی کۆماریدا، بێگومان ئەمە بەواتای بەرپانەبوونی سەرهەڵدانەکان نایەت، بەڵکو سەرهەڵدانی تورکمانی و جەلالییەکانیش هەبوون بەلام ئەنجامگیر نەبوون. بەواتایەکی دیکە، رێکخستنە سەربازییەکان دەسەلاتی کرداری گۆڕانکاری و وەرچەرخانەکان و

میکانیزمی دیالیکتیکیانەی راستەقینە بوو. هەربۆ نموونە: دەرکەوتنی سوڵتان مەحمودی دووەم و ئەو جموجۆڵە پاکتاوکارییە کوشندەیەی کە هێزەکانی مەحمود دژی ئینکشاریەکان دەستیان پێکرد ـ کە خوێناوی و تا دواڕادە توندوتیژ بوو ـ وەك ئێوەش دەزانن پاشان ئەرتەشێکی نوێ دادەمەزرێ. بەر لەم رووداوەش چەندین رووداوی هاوشێوە روویانداوە. بۆ نموونە: گشت شەڕەکانی جام شازاد و مستەفا شازاد و تەنانەت سوڵتان عوسمانیش بۆ بەرژەوەندی سەربازی بووە، واتە هیچ بەرژەوەندیەکی سڤیلی تێدا نەبووە. بەڵام لێرەدا هەندێك سەرهەڵدانی سڤیلیش هەبووە وەك سەرهەڵدانەکەی خەلیل باترۆنا.

**میهری بەللی:** بەڵام کۆنەپەرستانە بوو...

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** چ کۆنەپەرست یاخود پێشکەوتنخوازانە، لە گۆڕانکاری و وەرچەرخاندا خاوەن کاریگەرییەك نەبوو. گشتیان لە دەسەڵاتدارەکان بوون و مۆرکی سەربازییان بەسەردا زاڵبوو، یاخود راستتر بڵێین: زۆربەیان سەربازبوون، ئەمەیە واقیعی مێژووی تورکیا، مەسەلەکە لای "وەقاس قەلی"یش بەهەمان شێوەیە. هەمان شت لە کاتی مەشروتیەتی یەکەم و مەشروتییەتی دووەمیش بەتایبەت روودەدات، بێگومان مستەفا کەمال تەواو سەربازی بوو، واتە لەیەك کاتدا هێزی خۆی لە ئەرتەشی عوسمانی و ئەرتەشە نوێیەکەش وەردەگرت،

بەو واتایە، کودەتای 27ی ئایار ئەڵقەیەکە لە ئەڵقەکانی ئەو زنجیرە مێژووییە. دەبێ چۆن لێی تێبگەین....؟ داخوا پەیوەندی خۆی بە بونیادی کۆمەڵایەتییەوە نییە؟ هەڵبەتە پەیوەندییەکی پتەوی بە واقیعی نێودەوڵەتیشەوە هەیە. چونکە لە شەستەکاندا سۆسیالیزم پێشکەوتنێکی بەرچاو بەخۆیەوە دەبینێ، بزاڤە رزگاریخوازە نیشتمانییەکانیش لە هەڵکشانێکی بەرفراوان دان، هەروەها هەمان شت بۆ دیموکراسیخواز و سیستەمی نوێی داگیرکەریش راستە. لەبەیەك گەیشتنەوەی گشت ئەو پێشکەوتنانە دەبینین کە قۆناخیDP لە تورکیادا، قۆناخێکی قوڵبوونەوەی پەیوەندییە نوێیەکانی داگیرکەرییە. ئەوکاتە پێشکەوتنێکی دوو ئاراستەیی دەبینرێت. لەسەر ئاستی دەرەوە پاشکۆیەتی زیاتر دەبێت، لەسەر ئاستی ناوخۆییش زیاتر پشت بە موڵکدار و کۆمپرادۆرەکان دەبەسترێ. کودەتای 27ی ئایار ـ تا رادەیەك ـ لەژێر کاریگەری هەڵکشانی رزگاریخوازی نیشتمانی ئەوکاتە دایە. تەواو وەك کاریگەریبوونی مستەفا کەمال لە بیستەکاندا بە بەلشەفیکییەکان وایە. کودەتا 27ی ئایاریش تا رادەیەکی مەزن بە بزاڤەکەی جەمال عەبدول ناسر کاریگەرە، هەروەها دەکرێ بە بزاڤی بەعسیش

بچوێنرێ. هەروەها هاوکاتی هەڵکشانی بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی ئەفریقا و هەردوو شۆڕشەکەی کوبا و ڤێتنام بوو، گشتیان ئەگەر ناڕاستەوخۆش بێت کاریگەریان لەسەر کردووە. لەناوخۆدا کاردانەوەی چینی ناوەڕاست لەبەرامبەر وەرچەرخانی کۆمپرادۆریانە لە تەشەنە سەندندا بوو. پەیوەندی ئەفسەرەکانی 27ی ئایار لەگەڵ چینە ناوەڕاستەکان و بۆرژوازی بچووك لەنێودەوڵەتدا پەیوەندییەکی تۆکمە بوو. پێشکەوتنی سەرمایەداری کۆمپرادۆری بینەقاقای ئەو توێژە ناوبراوانەی گرتبوو. بەمەش دەکرێ 27ی ئایار لە چوارچێوەی ئەو رەوشە نێودەوڵەتی و پێشکەوتنە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییە ناوخۆییە تاوتوێ بکرێ. شایانی باسە، ئەو بزاڤەی ئەفسەرەکان وەك هەر بزاڤێکی دیکەی هاوشێوە پڕۆگرامێکی سیاسی جددی و رێکخستنێکی تۆکمەیان نەبوو. ناوی خۆی پڕ بەپێستی خۆیەتی: بزاڤێکی کودەتاییانە، بزاڤێك بۆ کردنەوەی گرێ کوێرەکان بەشێوەیەکی کاتی، دەڵێم: کاتی، کتوپڕ.

**میهری بەللی:** کتوپڕ.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ ئەوەی لە 27ی ئایار روویدا ئەمە بوو. هەوڵدانێك بوو بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکیەکان بەگوێرەی بنەما سەربازیەکان، بێ ئەوەی رەهەندێکی کۆمەڵایەتی، کە شایەنی باس بێت، یاخود قوڵاییەکی لە سیاسەتی دەرەوەدا هەبێ، لە راستیدا زێدە بیری لە پەیوەندیە چینایەتییەکان نەکردۆتەوە. بەڵام سەرەڕای ئەوەش بەشداری فراوانی لەمەوداکانی گفتوگۆ کرد و قۆناخێکی نوێی بەرەو پێشەوە برد، ئیدی ئاراستەکەی چ بەلای راست یاخود بەلای چەپەوە بێت. "تورکیش"یش یەکێك لە بەشداربووەکان بوو و هەوڵیدا پێشکەوتنەکان بەرەو فاشیزم ئاراستە وەربگرن، ئەمە لە کاتێکدا هەندێکی دیکە هەوڵیاندا بەرەو چەپ ئاراستەی بکەن. پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە گۆڤاری "ئاراستە YÖN" هەوڵیدەدا رووداوەکان بەئاراستەی چەپ بشکێتەوە. وەك ئێوەش دەزانن، کودەتاچیەکان لەنێو خۆیاندا سەبارەت بە ئاراستەی کودەتایەکە لەنێو ململانێیەکی توندوتیژدا بوون، هەندێك لەوانە دەیانخواست بەرەو راست بچێت، هەندێکیشان بەلای چەپدا ببیەن، پاشان وەك ئێوەش دەزانن تورکیا قەڵەمبازێکی چەپی لەسەر بنەمایەکی چینایەتی بەخۆیەوە بینی. راستە کودەتای 27ی ئایار لەدەرەوەی چوارچێوەی چەپ و راست دابوو، بەڵام MHP هەوڵیدا بەرەو پێشخستنی فاشیستانە رایبکێشێ، ئەمەشی لە چوارچێوەی کاری سەندیکاکانی تێکۆشان لە دژی کۆمۆنیستەکان و سەندیکاکانی لاوانی نوخبەو راستەوخۆ لەژێر ناوی خۆشیدا ئەنجامی دەدا،

شانبەشانی ئەمەش رەوتێکی ئایینی، واتا ئیسلامی سیاسی کە رەوتی ئەربەقانیەتە، دەرکەوت، هەموو ئەو پێشکەوتنانە پێشکەوتنی راست بوون، هەروەها لەهەمان کاتدا پارتی عەدالەت دامەزرا کە لە چوارچێوەی هەوڵدان بۆ زیندووکردنەوەیDP بوو. لەو کەش و هەوایەدا CHP خۆی ناچار بینی بەرەو چەپ ئاراستە وەربگرێت، بەڵام گرنگترین رووداوی ئەوکاتە لەدایکبوونی T1Pو قەڵەمبازی ئەو بزافە شۆڕشگێڕییەی لاوان بوو کە بەدوایدا هات. بەهاتنی حەفتاکان مەسەلەکان سەرلەنوێ دژوارتر بوونەوە و گرێکوێرەی دووەم دەرکەوت. بە دەربڕینێکی دیکە، نە راستەکان توانیان باڵادەستی فاشیستانەی خۆیان بسەپێنن و نە چەپەکانیش توانیان جڵەوی مەسەلەکان بگرنە دەست و ئاراستەی بکەن، بەمەش سەرلەنوێ بەرپرسیارێتی کەوتەوە سەرشانی سەربازەکان، وەك ئێوەش ئاگادارن کودەتای 12ی ئادار روویدا. لە 9ی ئاداردا بەر لە کودەتاکە بەچەند رۆژێك ـ موحسین باتۆر ـــ و هاوشێوەکانی هەوڵیاندا رووداوەکان بەلای چەپدا ــ یاخود نزیك لەمە ـــ بشکێننەوە، ئەمە لە کاتێکدا مەمدوح تاغماج و هاوشێوەکانی هەوڵیاندا بەرەو راستی ببەن. واتە ململانێی چەپ و راست لە کودەتای 12ی ئاداریشدا لە ئارادابوو.

**میهری بەللی:** برای موحسین باتۆر یەکێك لە ئەفسەر بەشداربووەکانی کودەتای 12ی ئادار بوو.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** بەڵێ، موحسین باتۆریش پاشان تەقلیان بوو و لە قۆناخی دواتردا رۆڵی خۆی لە ئاراستەکردنی رووداوەکان بە بەرژەوەندی راستەکان بینی.

**میهری بەللی:** ئەگەر هەوڵدانەکەی 9ی ئادار سەرکەوتنی بەدەست بهێنایە، ئەوا سروشتێکی وێکچووی کودەتای 12ی ئاداری وەردەگرت. هێڵی سەرەکی کاری گروپەکەی 9ی ئادار بریتی بوو لە: چۆن لاوان لە ژێر کاریگەری میهری بەللی رزگار بکرین...؟ ئەمە تەوەرەی گفتوگۆکانیان بوو.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** راستە، لەگەڵ بۆچونەکەت دام، بێگومان ئامانجی هەوڵدانەکەی 9ی ئادار و کودەتاکەی 12ی ئاداریش دامرکاندنەوەی بزافی لاوان بوو کە تۆش یەکێك بوویت لە سەرکردە چالاکەکانیان. ئەگەر کودەتاکە لە ئاراستەگرتنی بەرەو دیکتاتۆریەتێکی تەواو فاشیستیانە سەرنەکەوت، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هاوسەنگییە چینایەتیەکان رێگەی بەمە نەدەدا، هەروەها لەبەر ئەوەی فاشیستەکان تەواو بەسەر گۆڕەپانەکەدا زاڵ و باڵادەست نەبوون.

ئەگەر بڕوانینە ساڵانی 1970 ـ 1980 ئەوا دەبینین کە ئەرکی کودەتای 12ی ئادار بەتەواوی پاکتاوکردنی چەپ و خۆش کردنی کەش و هەوای تۆکمەکردنی ڕاست بوو لە ئاستێکی بەرزدا و، دواتریش بەدیهێنانی وەرچەرخانێك بوو بەرەو ڕاست و فاشیزم. بەڕاستیش هێزی ڕێکخستووی چەپ و داکشاو و لە ڕێچکەی خۆی لایدا و لەنێو خۆیدا شپرزەبوو، ئەمە لە کاتێکدا هێزی ڕاست بەخێراییەکی زۆر تۆکمە دەبوو و لە میانەی ئەزموونەکانی یەك و دوو و سێی بەرەی نەتەوەییەوە هێزی خۆی کۆکردەوە، ئیدی لەنێو ریزەکانی سوپاشدا ئەفسەرەکانی لەشێوەی 27ی ئایار نەما، بەڵکو ئەوانە...

**میهری بەللی:** دووچاری پاکتاوبوون هاتن...

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ دووچاری پاکتاو بوون هاتن. بەم شێوەیە...

**میهری بەللی:** لە 12ی ئاداردا هەزار ئەفسەر ڕووبەڕووی پاکتاو بوون بوونەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** پاکتاو بوون، بەو وانانەی کە لەکودەتای 12ی ئادار بەدەستیان هێنا، ڕێڕەوی گۆڕانەکان بەرەو ڕاستی فاشیزم چوو، بەهۆی میکانیزمی ئەو بزووتنەوەیەی کە بیرۆکراسیەکان لەسەری زاڵبوون، وەك دەزانن ئەوەی پێی دەووترێت نەوەی دووەمی چەپ ــ کە لەپرسێکی تردا بەجیاواز شی دەکەینەوە ـ تووشی هەوڵدانی پاکتاوکردنێکی بەتەواوی هات، بەتایبەت لاوانی شۆڕشگێڕ کە لەدوای ساڵی 1965 پێکهاتبوون، لەسەر دەستی کودەتای 12ی ئادار لێدانێکی توونەدیان بەرکەوت، پێویستە لێرەدا ئەم جیاوازیە بکەین: کاتێك لەکەسایەتی MHPدا فاشیزمی ڕاست ڕووی لەسەر هەڵدرایەوە، لەلایەن جەنەڕاڵەکانی 12ی ئەیلول ڕاستێك هەڵبژێردرا کە پێکهاتووە لە ڕێبازە ئایینیەکان.

**میهری بەللی:** پارتی ڕەفا دەستکردی جۆنتای سەربازییە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بێگومان وایە. بەگوێرەی تێبینیەکانی من کاتێك "کەنعان ئیڤرین" مەسەلەی ریسوابوون و ئاشکرابوونی MHP دەرکەوت، ئەوا ئەرکی بە "چاتلی" و هاوشێوەکانی سپارد، بێگومان MHPش لەنێو ئەوانەدابوو. واتە بەشی هەرە زۆری لە MHP ـ جگە لەوانەی خزێنرابوونە زیندان ــ بەتایبەتی ئەوانەی ئامادەی هاوکاری کردن بوون کەوتنە ژێر فەرمانی ڕژێمی 12ی ئەیلول و تەواو هاوکاریان کرد. لەهەموویان گرنگتر پێکهێنان و ڕێکخستنی تۆڕێکی بەرفراوان لە ڕێبازە ئایینیەکان بوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی گەیشتینە ئەو باوەڕیەی بزاڤەکەمان لە توانایدایە پێش بکەوێ. ئیدی بڵاوکراوە ئایینیەکان و ئایەتەکانی قورئانیان بە

هەلیکۆبتەر بلاو دەکردەوە و چەندین خولی فێرکردنی قورئانیان کردەوە و نزیکەی 100هەزار کەسیان تەڤلی ئەو خولانە کرد.

**میهری بەللی:** ئەوەی جێگەی سەرنجە سەرکردەی گشت ئەو تەریقەتە ئایینیانە خەڵکی ناوچەی رۆژهەلات بوون.

**عەبدوللّا نۆچ ئالان:** گشت ئەو کەسانەیان رێکخست، من هەوڵدەدەم لە شرۆڤەکردنی ئەو مەسەلەیەدا قوڵببمەوە، بۆچی..؟ چونکە ئایدیۆلۆژی فەرمی بەتەواوی لە گۆرێدا نەمابوو و نەیدەتوانی بەشێوازە کلاسیکەکان رووبەڕوومان ببنەوە. کەواتە دەبێ بە چ شتێك رووبەڕوومان ببنەوە؟ بە ئایدیۆلۆژی ئایینی.... ئەمەش بژاردنێکی تا دواڕادە و بەوشیاریە و سەرنج راکێشە، هەروەها مەودای ئەو تەریقەتانەیان فراوانتر کرد تا دەرەوەی تورکیاشی گرتەوە. ئایا باوەڕدەکەن بانگهێشتی سەرکردەی تەریقەتە ئایینیەکانی کە لەنێو کوردەکانی ئێراقدا هەن لە نموونەی "شێخ عوسمان" کردبێ و بە گەرمیەوە لە ئەستەمبوڵ پێشوازیان لێ کردبێ. شیمانەی هەرە زۆر دەگوترێت کە سەرۆکی دەوڵەت خۆی گۆرێکی تایبەتی بۆ "شێخ عوسمان" دوای مردنی دروست کردووە. نەك تەنیا لەناو تورکیا، بەڵکو دەستیان بۆ خاوەن تەریقەتەکان لە سوریا و ئێراقیش درێژکرد، من یەك لەوانە دەناسم ـ ئێستا ناوەکەییم لەیاد نییە ـ لەساڵی 1982دا چاوی بە کەسی " کەنعان ئیڤرین" کەوت و هەوڵیاندا لە رێگای ئەو کەسەوە کوردەکانی ماردین و ناوچەی جزیرە لە سوریا رێك بخەن. بە راستی ئەمە سەرسووڕهێنەرە... هەروەها هەوڵیاندا لە رێگای شێخ عوسمانیشەوە کوردەکانی ئێراقیش رێك بخەن.

**میهری بەللی:** ئەمەش کارێکی بە پیلان و ئاقڵمەندانەیە.

**عەبدوللّا نۆچ ئالان:** من لێرەدا هەوڵدەدەم رەگ و ریشەی ئەو مەسەلەیە شرۆڤە بکەم. تەنیا لە ئورفا (50) هەزار منداڵیان تەڤلی خولی فێرکردنی قورئان کرد ـــ بەگوێرەی سەرژمێری ئەو کاتە ـــ لە دیاربەکریشدا (100)هەزاریان تەڤل کرد، ئەمەش لە چوارچێوەی کارێکی رێکخستوو و بەپیلان ئەنجام دەدرا. سەرەڕای چەندین هونەرمەندی ساختەکار دەرکەوتن و هەموو شوێنێکیان تەنیەوە. ئایا دێتەوە یادتان کە چۆن فاشیەتی "فرانکۆ" کلیسە و وەرزش و هونەری بەکار دەهێنا؟ هەر سێکیانی بەکار دەهێنا، وانییە؟

**میهری بەللی:** کلیسە و وەرزش بەپلەی یەکەم دەهات.

**عەبدوللّا نۆچ ئالان:** هەروەها هونەریش. ئایا ئەو ڤیستیڤاڵە بەناوبانگانەت لە بیرکرد؟ ئایا هەمان شت لە تورکیاش رووی نەدا؟ ئایا لەتورکیادا لەمیانی

سالآنی (1980 ـ 1990) رۆژ بەرۆژ فیستیڤاڵەکان و چالاکیە وەرزشیەکان و تەریقەتە ئایینەکان لە گەشەسەندندا نەبوون؟ ئایا ئەو چالاکییانە لەچوارچێوەی هێرش هێنانە سەرمان نەبوو؟ ئەگەر بە ووردی و بەسەبرەوە گوێم لێ بگری گەلێك دەرەنجامی گرنگ بەدەست دێنی. کودەتاچیەکانی 12ی ئەیلول دەستبەداری ئایدیۆلۆژیای فەرمی بوون و هانایان بۆ ئایدیۆلۆژیایەکی نوێ برد، ئیدی حکومەتی رەفا دروست بوو بۆئەوە سەرکردە بەناوبانگەکانی تەریقەتە ئایینیەکانیان دەرخستە پێش. ئەوانە موسڵمانێکی دەستکردی 12ی ئەیلول بوون. لەنێو ئەوانەدا بەهەزاران هەبوون و کە لە وەختێکدا دەوروبەری سەرۆك وەزیرانیان پڕکردبۆوە. بەڵێ ئەمانە دەستکردی دەوڵەت خۆی بوو. ئامانج لەمەشدا "رزگار کردن"ی لاوانی ناوچەی باشووری رۆژهەلات بوو لە ژێر کاریگەری ئێمەدا، بێگومان لەم پێناوەشدا هەموو توانستێکی دەوڵەتیان بەکار هێنا.

**میهری بەللی:** لێرەدا لێم گەرێ با کەوانەیەك بکەمەوە، دەکرێ ئەم کارەیان لەم دەستەواژەیەی خوارەوەدا چڕبکرێتەوە! یان بەرەو لای رەنجدەران دەچێت و وشیاریەکی چینایەتی بەدەست دێنێ....

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** یان دەبێ تەسلیم ببیت....

**میهری بەللی:** پاشانیش بەرەو تێکۆشان هەنگاو دەنێت یاخود بەهۆی هزری چەپ و مارکسیزمەوە دەست بەسەر دەکرێت، ئەو هزرانە لەسەردەمی ئەمڕۆماندا هزری هەرە شۆڕشگێڕین، بەمەش چرای سەوز بۆ گێلە پیاو دادەگیرسێ.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** تەنانەت رێگایان بۆ دەکرێتەوە.

**میهری بەللی:** بێگومان بۆ فاشیستەکانیش....

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڕاستیش ئەمەیان بۆ فاشیستەکان و گێلە پیاوان ئەنجامدا.

**میهری بەللی:** سەرەڕای ئەمەش گۆڕەپانەکەیان بۆ چۆڵکردن بۆ ئەوەی زۆرترین هەستە سەرەتاییەکان بەکار بێنن. بە راستیش ئەم کارەیان بەوشیاری و بە پیلان ئەنجامدا، واقیعی ئەمڕۆش دەرەنجامی ئەو کارەیانە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لەمەدا هاوبیرین، چونکە دەستەواژەیەکی ئەقڵمەندایە بۆ گوزارشتکردن لە راستی، لەواقیعدا ئەم مەسەلەیە خۆی لەخۆیدا دەربازکردنی کۆماری کلاسیکیە. وەك ئێوەش دەزانن گفتوگۆ لەسەر کۆماری دووەم دەکرێت، لە راستیدا کۆماری دووەم ئەو کۆمارەیە کە لەگەڵ 12ی ئەیلول دایانمەزراند. چونکە شێوازی کۆنی کۆمار تا رادەیەکی زۆر کراسی ئایدیۆلۆژی خۆی گۆڕی و مۆرکێکی تەواو سەربازی وەرگرت ـ بێگومان

لەسەربنەمای راست ـ لەگەڵ ئاماژەکردنیش بەوەی کە مستەفا کەمال و ئیتحاد و تەرەقی و ئەفسەرانی 12ی ئایار لە ئارادانین، بەڵکو ئەوەی جڵەویان لە دەستە سەربازانی شەڕی تایبەت و ئەمریکا و گلادیۆن کە لە تەراتێن دان. ئیدی سەردەمێك دەستی پێکرد کە تێیدا ئیماندارە گێلەکان و فاشیستەکان لەگەڵ ئەوانەدا (سەربازەکان) لەنێو پەیوەندیەکی تۆکمە و پتەو دابوون.

لێرەدا لەوانەیە بپرسن: ئەی ئۆزال چییە؟ ئۆزال پیاوێکی دەوڵەت بوو، پێداویستی و داخوازیەکانی چینێکی بازرگانی بۆ وەرچەرخانێکی سەرمایەداری و بەرژەوەندیە ئابووریەکانیان بەدی دەهێنا. ئەگەر هەردەبێ پێناسەیەکی ئۆزال بکەین تەواو دەکرێ بووترێ ئۆزال سەنتێزی ئەو پێکهاتانەیە؛ سەنتێزی سیاسی و موخاتەبی ئابووریەکەی بوو، ئەو پیاوە بوو کە کودەتای 12ی ئەیلولی بۆ ئابووری گۆڕی و مۆرکێکی سیاسی پێبەخشی، لەمەشدا رۆڵێکی تایبەتی جێبەجێ دەکرد.

بەڵام لەگەڵ گەیشتن بە سالانی (90)کان تێکۆشانی ئێمە بەهەموو شکۆمەندی و توانایەوە دەچێتە سەرشانۆی مێژوو. مەبەستم لەمەدا تەنیا بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد نییە، چونکە راستینەی مێژوویی تورکیا بەشێوەیەکی نوێ وەردەگرێ کە لە بزاڤی نەتەوەیی کورددا بەرجەستە دەبێت. بەهاتنی (90)کان، کە لەسەر بنەمای قەڵەمبازی 15ی ئاب پێشکەوت خۆی لەخۆیدا باسکردنی ئەو قۆناخە مێژوویە زۆر سودمەندە ـ مێژووی تورکیا لە ئەنجامی ئەو مەیلە ناوبراوەدا بووە، سەرخانی شەڕی رزگاری نەتەوەیی. ئەوکاتە دەوڵەت، لەلایەکەوە بەو شێوەیەی کە باسمانکرد خۆی رێکخست و جاش و (حزب اللە) و رێبازە ئایینەکان و دەستەی فاشیزم و چاتڵی و چەندی دیکە کەوتنە جموجۆڵەوە و بەمەش دەوڵەت زۆر بەخێرایی بووە دەوڵەتی مافیا و چەتەکان.

وەك دەزانن ئەو قۆناخە بەدوو ئاقار ئاراستەی وەرگرتبوو، یەکەمیان حکومەتی شەڕی تایبەت بوو کە ئەمریکا پشتگیری لێدەکرد و لەژێر سەرکردایەتیەکی سیاسی ئابووری وەك ئۆزالدا بوو. دووەمیشیان بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد بوو کە بەتەنیا و لە رەوشی هەرە دژواردا رێبەرایەتیان کردووە. لە راستیدا لایەنی هەرە بەرچاویش ئەمەبوو و بێگومان هەرکەسێکیش ئەم راستیە دەزانێت، بەڵام لەگەڵ هاتنی ساڵی 1990دا ئەوە روون بۆوە کە هەرگیز ناکرێ ئەم رەوشە بەم شێوەیە بەردەوام ببێ.

خاڵی هەرە سەرنج راکێش لەو قۆناخەدا وەك ئێوەش دەزانن؛ بەرپابوونی شەڕی کەنداوە کە بۆ ئەمریکا گرنگییەکی زۆری هەبووە. بۆئەوەی جەنگەکە

بەسەرکەوتوویی کۆتایی پێ بێت. دەبوایە تورکیا بەشداری تێدا بکردایە، ئەمەش بەواتای دەربازکردنی ئەو رەوشە دێت کە لە تورکیا لە ئارادابوو و ئۆزال نوێنەرایەتی دەکرد، بەڵام سیاسەتی کلاسیکیانەی دەوڵەت رێگەی بەمە نەدا و مەسەلە گەیشتە ململانێیەکی خوێناوی، بەمەش کاریگەری باڵادەستێتی ئەمریکا زیاتربوو. لەو قۆناخەدا حیسابات و لێکدانەوەکانی جەنەراڵەکان لە گەوهەری خۆیدا بریتی بوو لە ترس لەبەرامبەر سوود وەرگرتنی بزاڤی کوردی لە هەر هەنگاوێکی چەوت، هەروەها ترس لەوەی کە ئەو بزاڤە لەمیانی هەر چەوتیەك کە تێی بکەون پێشکەوتنێکی بەرچاو بەدیبهێنێ. هەربۆیە هەموو هەنگاوێکیان بەگوێرەی ئەو ترسە دەهاوێشت. وەك دەزانرێت لەو قۆناخەدا سەرۆکی ئەرکان (تۆرمتای) بەهۆی گوێرایەڵ نەبوونی بۆ سیاسەتەکانی ئۆزال خانەنشین کراو هێدی هێدی جەنەراڵ (گورەش) شوێنی گرتەوە. من وای بەباش دەزانم ئەم بابەتە زیاتر شیبکەمەوە، چونکە سوودی خۆی هەیە.

بەڕای من دۆغان گورەش جەنەراڵێکە لەسەرووی گشتی جەنەراڵەکانی 12ی ئادار و 12ی ئەیلولەوە دێت، هاتنی ئەو وەك کودەتای هەرە فاشیست و گشتگیرە. بەڵام سەرەڕای ئەمەش کودەتاکە بەسووکی و لاوازی بەڕێوەچوو و زێدە خوێناوی نەبوو. بۆچی؟ چونکە خواسترا مەسەلەی بوونی بەچەتە بەشێوەیەکی هەرزان سەرگیر بکرێت. کەچی لەکاتێکدا ئەم مەسەلەیە شایستەی ئەوەیە بەردەوام تاوتوێ بکرێت، بەڵام ئەو تاوتوێکردنە هەرچۆنێك بێت خاڵێکی سەلمێنرا و هەیە کە پێویست بەگفتوگۆکردن ناکات، ئەویش ئەوەیە هاتنی ئەو (واتە: گورەش) تەنیا کودەتایەك بوو، ئەمەش ئەوەی خستە روو کەسیاسەتی ئۆزال سەبارەت بە"کەنداو" دەرفەتی جێبەجێ کردنی نییە و مەسەلەی دانپێدانان بەکوردان دەبێتە هۆی دروستکردنی قەبارەیەك بەخۆیان، (تۆرمتای) ئەمەی رەتکردەوە و گورەشیش دەرکەوتە مەیدان و ئەم مەسەلەیەشی بۆخۆی کردە خاڵی پێهەلگرتن. بەتایبەتی لەم خاڵەدا ئۆزاڵ دەیووت "ئەو جەنگە بەسەر ئابووریدا شکایەوە و هەمووی هەلۆشی هەربۆیە دەبێ مەسەلەکە بەسیاسی چارەسەربکرێ ـ لەم هەنگاوەیدا (واتە ئۆزال) پشتیوانی و هاندانی ئەمریکای لە پشت بوو ـ چونکە رەوشەکان دژواری زۆرمان بۆ دێنێ" ئەوەی شایەنی باس بێت ئۆزال سیاسەتێکی تایبەتی بەرامبەر بە ئێراق هەبوو، ئەمەش لە سیاسەتی خۆیدا بەرامبەر بەکوردان پێویستی بە وەرچەرخانێك دەکرد.

پاشان منیش جدیدیەتی ئەوانم تاقیکردەوە، شاندێك لە رۆژنامەوانان هاتنە لام، کە "جوا ئۆغلۆ" تێدابوو، ئەو پێی ووتم "ئۆزال دەیەوێ هەنگاو

بهاوێژێ" منیش ووتم "باوەڕناکەم، چونکە ئەمە پێویستی بەگۆڕانکاریەکی رەگ و ریشەیی لە سیاسەتی کۆماردا هەیە و هێزی ئەویش بەشی ئەمە ناکات".

ئەو بەوشێوەیە وەڵامی دامەوە:"نەخێر، ئۆزال لە هەنگاونانێکی بەمجۆرەدا دلێر و جددییە" ئەو کاتە بۆم دەرکەوت کە لەنێو خۆیاندا مەسەلەکەیان تاوتوێ کردووە، بەڵام باوەڕیشم نەدەکرد. بەڵام دوای ئەزموون وەرگرتن بۆم روون بۆوە کە ئۆزال بەڕاستی دەیەوێ هەندێ هەنگاو بهاوێژێ، بەتایبەتی دوای ئەوەی هەندێ رۆژنامەوانی تریش جەختیان لەسەر هەمان بابەت کردەوە. بێگومان وەڵامدانەوەی من پۆزەتیفانە بوو و ووتم: "وەرچەرخانێکی سیاسی سەبارەت بە مەسەلەی کورد شتێکی زۆر بەهادارە. لەهەمانکاتدا پێم ووتن:"هێزە موحافەزکارەکان ئەو دەرفەتەی پێ نادەن. دواتریش بەکرداریش دەرکەوت کە ئۆزال بەشێوەیەکی یۆتۆپیانە بیری دەکردەوە و محافەزەکاران زۆر بەهێزتر بوون لەوەی کە مەزەندەی دەکرد. لەوانەیە بپرسن ئەو محافەزەکارانە کێ بوون.

**میهری بەللی:** بەڕاستی کابرایەکی دلێر بوو، بەڵام باجی دلێریەکەشی ژیانی بوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەم بابەتە زیاتر شیدەکەمەوە. چونکە روونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە بۆ پراکتیزەکردنی کاری سیاسی لەڕۆژی ئەمڕۆماندا سوودێکی گەورەی هەیە، ئەگەر نا هەروا بەسانایی بەڕێوە ناچێ. لێرەدا نامەوێ زۆر لەسەر کەسێتی ئەو گورەشە رابوەستم، بەڵام ئەوانەی دەیناسن و لێوەی نزیکن جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە کەسێتیەکە لەنێو سوپادا بەخێرایی هەڵکشا و لەپێناو گەیشتن بە پلەی سەرۆکایەتی ئەرکان چی لەدەست هات کردی، ئەو پلەو پایەشی بۆ کاری سیاسی بەکارهێنا. لەڕاستیدا ئەو چارەنووسەی کە ئۆزال پێی دەگەیشت باشی دەبینی، بەڵام هەلپەرستانە هەڵسوکەوتی کرد. لەسەرەتادا کاتێك دووچاری ئاستەنگی و تۆرمتای و چەندین کۆسپی دیکە بوو لەئۆزال نزیك بۆوە و هەڵوێستی ریاکارانەی وەرگرت. لەڕاستیدا لەدەربازکردنی ئەو کۆسپانە بەتایبەتی کۆسپی تۆرمتای سەرکەوت و گەیشتە پلەی سەرۆکایەتی ئەرکان، بەڵام لەڕاستیدا ئەو کەسێکی موحافەزەکار و چەقبەستوو بوو. لەم خاڵەدا چەندین فرتوفێڵ لەئارادا هەیە کە کەمێك دەرفەتی بۆ رەخسا و رێگای بۆ کرایەوە و پیلانی لەناوبردنی ئۆزالی داڕشت. ئەمەش پیلانێکی گومانلێکراو و سەرسووڕهێنەرە، ئەمڕۆش خوازیارن پیلانێکی بەمجۆرە ــ لەلایەن سوپاوە ــ دابڕێژن و ناوی کودەتای

سەربازی لێدەنرێ. بۆ روونکردنەوەی راستینەی ئەو مەسەلەیە دەمەوێ لێرەدا تیشك بخەمە سەر ئەو زنجیرە کودەتاییانەی کە بەدوای یەکدا هاتوون.

ئەگەر بەو شێوەیەی لە هەردوو کودەتای12ی ئادار و 12ی ئەیلول دەڕوانین بەهەمان شێوەش لەم کودەتایە بڕوانین، ئەوا وەکو پێویست ناتوانین لێی تێبگەین. ئەو کودەتایە کودەتایەکی بێ مێژووە و هیچ کودەتایەکیش لەم کودەتایە ناچێت، لەقسەی ئەو (5) جەنەڕاڵە ناچێت کە گوتیان: "کودەتایەکی سەربازیمان ئەنجامدا و ئەوا هاتین"، هەروەها تەنیا بە بەراوردێکی سادە و ساکاریش ناتوانین لێی تێبگەین، بەڵام خاڵی سەلمێنراو ئەوەیە کە ئەم کودەتایە کودەتایەکی نەخشە بۆکێشراو بوو و یەکسەر رێگای لەبەردەم گورەش خۆشکرد کە بتوانێ هەردوو کۆسپی بەردەم خۆی ــ تۆرمتای و ئۆزال ـ دەبازبکات و پشتگیری بەدەست بێنێ. چونکە ئۆزال وەکو ئاماژەم پێکرد لەسیاسەتی خۆیدا شێلگیر بوو و گورەشیش لەگەڵیدا تەواو ناکۆك بوو. ئەو کاتە گورەش دەیگوت: قسەکردنمان لەسەر فیدراڵیەت واتە پەلکێش کردنمان بۆ پەتی سێدارە، مەگەر بچینە گۆڕەپانی مانگی سوور ــ ئەمەش بەو واتایە دێت چارەسەرکردنی کێشەی کورد بۆ ئەو وەك لەسێدارەدان و مردن وایە.

لەمیانەی ئامادەکاریەکانیدا هەندێ کار ئەنجام دەدران کە پێویستە لێرەدا باسیان لێوە بکرێت، هەر بۆ نمونە سەردانێکی زانراوی هەیە بۆ لەندەن کە بەئامانجی بەدەستخستنی هاوکاری دەرەوە بوو. چونکە چاك دەیزانی کە هەرگیز ناتوانێ وەك کودەتاکانی دیکە کودەتایەك ئەنجام بدات ئەگەر پشتیوانی دەرەوە و بەتایبەت ئینگلتەرا و ئەمریکای لەپشت نەبێ. خۆی ئەم تاقیکردنەوەیە ئەنجام دەدات و دەڵێ "ئینگلتەرا چرای سەوزی بۆ داگیرساندین"، ئەمەش لەساڵی 1990 ــ 1991 دا بوو. پاشان ئەمەشی دەخاتە سەرو و دەڵێ "دەستخستنی پشتیوانی ئینگلیز بۆ ئێمە زۆر گرنگ بوو". لەلێدوانێکدا ئەو رستەیەی زۆر بە روونی باسکردووە و "مەحەمەد عەلی قشلال"یش لە پەرتووکەکەی خۆیدا بەناوی "جەنگی توونەد و تیژی کەم"دا ئەو رستەیەی هێناوەتەوە. لەو پەرتووکەی خۆیدا بەشێوەیەکی باش کەسێتی گورەشی راڤە کردووە، زۆربەی مەزەندەکان ئەوەیە کە لەم رووەوە هەندێ زانیاری لە سەرۆکی ئەرکان وەرگرتبێت. ئەم پەرتووکە شایستەی خوێندنەوەیە.

بێگومان شانبەشانی پشتیوانیەکەی ئینگلیز پێویستی بە پشتیوانی ناوخۆییش هەبوو. وەك دەزانرێ لەو قۆناخەدا لەئاستێکی بەرفراواندا دروشمێك باو بوو:"لەگەڵ ئۆزالدا تەبا نابین" خاوەندارانی ئەو دروشمە

DYP و SHP بـــوون، وەك دەزانـــرێ ئـــەم دروشمـــە رۆڵـــی لـــە بەســـتنی هاوپەیمانێتی دیمریل و ئینۆنۆدا هەبوو، مەسعود یەڵماز بۆ سەرۆکی وەزیـران دەستنیشـان کـرا، بـەڵام دەترسـا بۆیـە یەکسـەر دەسـتی کێشـایەوە. ئیـدی دەربـازکردنیANAP پێویسـتیەك بـوو دەبوایـە بکرایـە. لەسـەر مەسـعود یەڵماز دەووترێت"دەستی لێ بەردا و هەڵات" ئەمە راستە، بەڵام ئەمەی لەژێر فشارەکانی گورەیش واتە سەرۆك ئـەرکان ئەنجامـدا، پاشـان رێککەوتنی نێـوان دەمیرێل و ئینۆنوی بەدوادا هـات و هەڵبـژاردنێکی پێشوەخت لەساڵی 1991 ئەنجامدرا و مەسعود یەڵماز ناچاری شکست (کشانەوە) کـرا و ANAP وەك رەوشـــی ئـــەمڕۆی DYPی بەســـەرهات. بەڕاســـتی ئەمـــە مەســـەلەیەکی سەرسووڕهێنەرە، ئەوانەی ئەوکاتە ANAP یان دووچاری ئـەو رەوشـە کـرد ئەمڕۆش دژە هەڵمەتێك لەبەرامبەر DYP ئەنجام دەدەن و دەیخەنـە هـەمان رەوشـەوە. لـەوەش سەرسـووڕهێنەرتر ئـەو مەسـعود یـەڵمازەی کـە لەوکاتـەدا ناچاری ئەو هەڵمەتـە کـرا، کەچـی ئـەمڕۆ حکومەتەکـەی لەدەسـەڵات بـەدوور دەخرێ. من بەگرنگی دەزانم کە بەووردی و تێر و تەسەلی لێکۆڵینەوە لەسەر ئـەو سـەردەمانە بکـرێ. ئیـدی لەگـەڵ دامەزرانـدنی حکومەتەکـەی دیمریـل ـ ئینۆنۆدا ئەوە روون بۆوە کە هەر دەبـێ ئۆزال تیابچێت، چونکە دەوروبـەری گەمارۆ درابوو و لەنێو ANAP دا گـەلێك گۆڕانکاری مـەزن ئەنجامـدرابوو و مەسـعود یـەڵماز رووبـەڕووی ئـۆزال کرابـۆوە. لەکۆتاییـدا ئۆزالیـان خسـتە رەوشێك تەواو وەك ئەو رەوشە وایە کە ئەمڕۆ چیللەر بەرەو رووی بۆتەوە.

لەماوەی ئەو دیالۆگە ناڕاستەخۆیەی کە لەنێوانماندا لەئارادا بـوو تاڵـەبانی جـەختی بـۆ مـن کـردەوە کـە تورگـوت ئـۆزال دەسـتی خستۆتە بـەر سـینگی و ووتویەتی: "ژەنەڕاڵ بەدلیسیش لەگەڵماندایـە، ژەنـەڕاڵ فلانـیش لەناوەڕاسـت لە پەلەکوتێدایە" مەبەستیشی گورەش بوو. لەڕاستیشدا گورەش لەناوەڕاسـتدا پەلـەکوتێی دەکـرد. وەك ئـۆزال دەیـووت:"بـەڵام دەتـوانین لـەڕیزی خۆمانـدا قازانجی بکەین". وا دیار بوو سیاسیەتیان لەسەر ئۆزال دەکرد و هـەوڵیان دەدا بـەکاری بهێـنن. لـەو کاتـەدا ئـەوەم بەرچـاو کـەوت کـە ئـۆزال کەسـایەتیەکی جددییە و سیاسـەتی خـۆی هەیـە، بـەڵام رووبـەڕووی توێـژێکی بـەرفراوان لـە رکەبەران بۆتەوە. وەك ئێوەش باش دەزانن بەتایبەتی لەو سەردەمەدا..

**میهری بەللی:** ژەنەڕاڵ بەدلیسیش ژیانی تیاچوو.

**عەبدوڵڵا ئۆچ تالان:** هـەموویان تیاچـوون! ئەوکاتـە لقێکـی موخابـەراتی جەندرمـــە هـــەبوو کـــە ژەنـــەڕاڵ بـــەدلیس سەرپەرشـــتی دەکـــرد و جـــەم ئەرسەڤەرەکانیش تێدا دەچن. نامەوێ بکەومە نێو فراوانی مەسـەلەکەوە یـان فراوانـــی ئـــەو مەســـەلەیەوە. ئـــۆزال تیاچـــوو، وەك ئێـــوەش دەزانـــن گـــەلێك

پێشکەوتنی ترسێنەر هاتنە ئاراوە. ئەو کاتە "بەختیار ئایدن"ی دیاربەکری لە پیلانگێڕیەکدا کە تا ئێستاش روون نەبۆتەوە پاکتاو کرا. زنجیرەیەك پاکتاوکاری دیکەشی بەدوادا هات وەك پاکتاوکردنی سەرهەنگ (عقید) عوسمان لە دێرسم و سەرهەنگێکی دیکەش لە ماردین، ئەمانە چالاکی پاکتاوکاری ناوخۆیین، پاکتاوکاری و کودەتان .... تکام وایە بەهەڵە لێم تێنەگەن، چونکە تائێستاش دوورن لە تێگەیشتنی رەهەندەکانی ئەو کێشەیە، ئەگەر شرۆڤەی بکەم ئەوا دووچاری سەرسام بوون و تێرامان دەبنەوە و لە تێڕوانینتاندا قوڵبوونەوەیەکی زیاتر بەدیدێت. ئەمە پاکتاوکارییەکی ترسناك و دژوارە! چونکە ئۆزال لەئەنجامی نەخۆشی یاخود شتێکی دیکە تیانەچوو، پزیشکەکان راستگۆیانە هەڵسوکەوت ناکەن. ئۆزال بەرخۆدانی کرد و تەسلیم نەبوو، وەك چیللەر و ئەربەکانیش هەڵنەهات، بەڵکو بەرگەی گرت و تیاچوو. باش سەرنج بدەن ئەو رووداوانە لەو قۆناخەدا بەشێوەیەکی گومانلێکراو بەدوای یەکدا هات و هەر تەنیا رێکەوتێك نەبوو، پاکتاوکردنی کارسازانی کورد لەساڵی 1993 ئەوپەڕی هۆڤێتی بەدوادا هات. تیاچوونی ئۆزالیش 1993 روویدا، هەروەها رووداوی ژەنەراڵ بەدلیس و رووداوەکانی سێواسیش بەهەمان شێوە.

بەر لەچەند رۆژێك رستەیەك لە وتاری نێردراوێکی فەرمی کە لەرۆژنامەی (سیاسەتی ئازاد ـ ئوزگور پۆلۆتیکا) بڵاوکراوەتەوە سەرنجی راکێشام، باوەڕ ناکەم کە زۆربەی کەس هیچ شتێکی لێ تێگەیشتبن، لە رستەکەدا هاتووە:"کاتێك لە سێواس بووین فەرمانێکمان لە ئەنکەرەوە پێی گەیشت تێیدا هاتووە کە: "موسا ئەرئۆغلۆ بۆ ئەنکەرە بگەڕێوە" بەڕاستیش ناوبراو یەکسەر دەگەڕێتەوە" نووسەری وتار نەسیمی چیمن دەڵێ:"دەبووایە بەمجۆرە روویندابوایە، ئەمە حاڵەتێکی ئاوارتە بوو. بۆچی ناردراو دوایی بۆ ئەنکەرە بانگ کرایەوە؟" هەر لەگەڵ خوێندنەوەی رستەکە بەتەواوی تابلۆی رووداوەکانم بۆ روون بۆوە." بەفەرمانی دەوڵەت پیلاننامەی ئەنجامدانی کۆمەڵکوژییەك دارێژراوە. موسا ئەرئۆغلۆ تورکمانە و لەکوردانیش نزیکە. لەرێیەوە دەخوازرێ گورزێك لەسێواس بوەشێنرێ. عارف ساغ لەدوای ئەوە بەرژێمەوە گرێدرا و، دەخوازن موساش بخەنە سەر ئەو کارە.

دەووترێ کە سەرهەڵدانکار و چەپڕەوە، واتە بەدوای دەوڵەت ناکەوێ. بۆ ئەو رۆژگارە بگەڕێنەوە لەسەر عارف ساغ لێکۆڵین بکەن دەبینین کە چۆن بۆتە پیاوی دەوڵەت و "خەلاتی دەوڵەتی بۆ هونەرەکان"ی پێ بەخشرا. گشت قوربانییەکان لە هونەرمەند و شاعیرە میلییەکان بوون، لەوانەیە زۆربەیان لە شاعیرە شانۆکارە چەپەکان بن. گشتیان لەیەك بۆنەدا کۆکردبۆوە و زەبرێکی

کوشندەیان لێدان. ئەمە لەساڵی 1993 دا روویدا. هەروەها رووداوەکانی گەڕەکی "غازی عوسمان پاشا" و کوشتنی ئەو ئەفسەر و ژەنەڕاڵانەی پێشتر باسمان کردن، پاکتاوکردنی "ئەرسەڤەریش"......

بەڕاستی کودەتایەکی ترسناك بوو. رووداوی کوشتنی لەمجۆرە لەمیانەی کودەتاکانی 12ی ئادار و 12ی ئەیلول و 27ی ئایاریشدا نابینی. بۆیە ئاماژەی پێدەکەم چونکە پڕ لەکینم. ئەوە کودەتایەکی مەزن بوو، کودەتایەکی تا دواڕادە خوێناوی بوو، سەرەڕای ئەوەی رووداوەکانی ئەو رۆژگارە زۆر بەڕوونی ئەوە دەسەلمێنێ، کەچی بەئاشکرا ناوی لێنەنراوە، هەروەها بەسەدان لەکارسازانی کورد پاکتاوکران و چەندین تاوانی بکەرنادیاریش لەئارادان....

**میهری بەللی:** گەیشتبووە ترۆپکی خۆی.

**عەبدوڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ گەیشتبووە ترۆپکی خۆی. کودەتایەکی خوێناوی بوو. ئەو راستیانەی کە پاشان رووداوەکەی "سوسورلوك" ئاشکرای کرد چیبوون؟ گشت ئەو تاوانانە لە رەفتاری چەتەکان بوو، پێویستە وەها سەیریان نەکەین گوایە گروپێکی بەرتەسکن. گشتیان تاوانبارن و کاری گوشتنیان ئەنجام داوە، بۆ نمونە "وەلی کوچوك" ژەنەڕاڵی ژەندرمە دەستی لە کوشتنی کارسازەکانی کورد لە "قۆجە ئیلی" هەیە، کە خۆی لێپرسراوی ئەوێ بوو و یەکێك لە پیاوەکانی "JİTEM"ە. "چاتلی"یش وەك ئێوە دەزانن لە لاوە نوخبەکانە، ئەویش بکوژێکی دڕندەیە. لەڕاستیدا نمونەی ئەوانە زۆرن کە خواستبێتیان لەپێناو رفاندنی پارە و پوول هەر کەسێك بکوژن.

دەرئەنجام: بە تێپەڕبوونی ساڵی 1994 کودەتاکە سەرکەوتنێکی رەهای بەدەست هێنا. "دۆغان گورەش" بەم شێوەیە گوزارشتی لێ دەکات: "ئیدی بەخاڵی لوتکە گەیشتین و سەرکەوتن مسۆگەرە". کێن ئەوانەی بەخاڵی لوتکە گەیشتن؟ هەندێك لەپیاوانی JİTEM کە خۆیان لەنێو ریزەکانی ژەندرمە رێکخستبوو، بەشی هەرە زۆر لەهێزەکانی ئاسایش لە نموونەی وەك: مەحەمەد ئاغار و ئۆنال ئەرقان، گورەش خۆشی لە وان بوو، هەروەها بازرگانانی شەڕ و ئەو سیاسەتمەدارانەی دەستیان بەسەر سەرچاوەکانی سەروەت و ساماندا گرتووە، بەرپرسە دیارەکانی گوند پارێزەکان لە کوردستان، ئەوانەی هەموو کەسێك دەیانناسێ و بەڕاستیش کودەتایەکی فاشیستانە بوو کە بیرۆکراسیەت پشتیوانی بوو.

**میهری بەللی:** بێگومان کاردانەوەی خۆی لەسەر پەرلەمانیش هەبوو.

**عەبدوڵا نۆچ ئالان:** زۆر سەرنج راکێشە، چیللەر سەری بەرەی سڤیلە، نازانم ئێوە بینیتان سەرنج راکێشە، دوێنێ گورەش وێنەیەکی دروستکرد، لایەکی چیللەر بوو لایەکەی تر ئەتاتورك بوو، بەسەر سەری خۆیەوە کردبوو،

زۆر سەرنج راکێشە، کودەتای فاشی ئەوەندە سەرنج راکێش و بەدەنگە، بۆ نمونە کودەتا....

**میهری بەللی:** بێگومان ئەربەکانیش لەناودایە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ ئەوانیش بەشداری زنجیرە بوون، لەدوایدا بەشداربوون بەرێگەپێدانی گورەش، دیقەت بکەن ئەوانە لەدژی دەرنەکەوتن، بەلام بەناکۆکی بەشداری بوون، ئێستا ئەوەشتان بۆ شی بکەمەوە، لەناو سوپادا جارێکی تر تەرازووی هێزەکان رۆڵی هەیە، ئەگەر من باسی ئەو کودەتا سەرگرتووەتان بۆ بکەم بەراستی رای گشتی و رۆشنبیران سەرسام ببن.

**میهری بەللی:** کودەتایەکی فاشیستانەیە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** کودەتایەکی تەواو فاشیستانە بوو، هەروەها لە رووی بەرنامەی دارێژراو و کاتی دیاریکراوی و ناوەڕۆك و ئامانجەکان و چۆنیەتی جێبەجێ کردنی زۆر سەرسووڕهێنەر بوو، بەمەش خۆی لەخۆیدا کودەتایەکی فاشیستانە و سەرسوڕهێنەر بوو.

بۆ زیاتر راڤەکردن پێویستە ئامازە بەو خاڵەش بکەم: هەموو رۆژێك سیاسەتمەداران لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن دەردەکەوتن و بەدرێژ دادڕییەوە قسەیان دەکرد: "چەتەکان هێز لە دەوڵەت وەردەگرن" بەبێ ئەوەی یەکێکیان توانستی پێویست بخاتە روو بۆئەوەی ئەو رووداوەی رووبەڕووی دەبنەوە شرۆڤەی بکەن. هەندێکیان دەیانووت:"ئەمە حوشترە و ئەمەش مووەکەیەتی" و هەندێکی تریشان دەیانگوت:"ئەمە حوشتر و پشتی خوارە"؛ بەم جۆرە هەوڵیاندەدا دیاردە و رەوشەکە باس بکەن. هەڵبەتە ئەوە کودەتایەکی بەپیلان بوو، بەشێوەیەکی باش ئامادەکرابوو و کودەتایەکی فاشیستی بوو کە زۆر بە دژواری بەرێوەبرا. نامەوێ بکەومە نێو دووبارەکردنەوە، بەلام ئەگەر تەنیا بۆ ئاماژەش بێت، بەپێویستی دەبینم ئەوە بەبیر بهێنمەوە کە سەرۆك کۆمار، ژمارەیەك لە ژەنەراڵ، پیاوانی ئاسایش پاکتاوکران و هەندێك سیاسەتمەدار کوژراون.

لەم نێوەندەدا مەحەمەد سنجاریش لە ساڵی 1993دا کوژراوە، دوو پەرلەمانتاری کوردیش، لەیلا زانا و خەتیب دیجلە، خرانە زیندان. زیندانکردنی ئەمانە هاوکاتە لەگەڵ هەمان هەڵکەوت. بەشێوەیەکی بێ بەزەییانە پیاوانی دەوڵەمەند کوژراون. بەهەزاران تاوانی بکەری نادیار ئەنجام دراون و هەروەها بەهەزاران گوندی کوردیش لەمیانەی ئەو قۆناخەدا بەتاڵ کراون و رووخێنراون.

شانبەشانی ئەمەش ئەمریکا کەوتۆتە نێو ئەم کارەوە بەو رادەیەی کە سیخوڕی خۆی بکاتە سەرۆك وەزیران. ئەوە مسۆگەر کراوە کە سەرۆك

وەزیران سیخوڕێکی ئەمریکایە و پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ CIA هەیە. ئەوە زۆر سەیرە، لە رابردوودا ئەمە بەو جۆرە نەبوو. کاریگەری ئەمریکا لە 27ی ئایار ناڕاستەوخۆ بوو، لە 12ی ئادار و 12ی ئەیلول تا ئەو رادەیە نەبوو، بەڵام ئەمجارە سەرۆك وەزیران (تانسۆ چیللەر) سیخوڕی CIAیە. ئەمریکا تا ئەو رادەیە کەوتۆتە نێو کاروبارەکانەوە.

رەنگە لێرەدا بپرسن کە دەخوازرێت لە رێگای ئەم کودەتایەوەوە چ بەدەست بهێنرێت؟ لە رێگای ئەم کودەتایەوە دەخوازرێت وەکو رژێمی فاشیستی فرانکۆی ئیسپانیا، لە تورکیادا رژێمکی دێوەزمە، لە سالانی 2010 تاوەکو 2020سەقامگیر بکەن. پێویستە ئەمە بچووك نەکرێتەوە و پێویستە سەیری ئەم رووداوە نەکرێت وەکو رووداوێکی هەنووکەیی کە کودەتای تێدا هاتە ئاراوە. ئەمە چۆن روویدا؟ ئەگەر بەکورتی باس لەم خاڵەش بکەم، ئەوا بەتەواوەتی ئەم تابلۆیە تەواو دەکەین.

من رووبەڕووی ئەم کودەتایە بوومەوە و ئەم شەڕە دژوارەم بەڕێوەبردووە. بەڵام کاتێك لەگەڵ ئۆزالدا، دەرفەتی دیالۆگی سنووردار رەخسا و دەرفەتێکی زۆرباشی چارەسەری سیاسی هاتەکایەوە شتێکی گەلێك گرنگ و بایەخداربوو. بەڵام دواتر ئەوەم بینی کە چۆن هەوڵدەدرێ ئەم هەنگاوە مایەپوچ بکرێت و، هەر تەنیا بەمە نەوەستان، بەڵکو موخاتەبەکەش پاکتاو دەکەن. پێویستە سەرنج بدەینە ئەم خاڵە. ئەوکات بڵاوکراوەیەکم بەناوی "لە موخاتبێك دەگەڕێم" نووسی. چونکە موخاتبەکەم لەنێوبرابوو. ئایا دەزانن بۆچی جەنەراڵ بەدلیس کوژرا؟ چۆنکە ئەو دژی پاکتاوکردنی لادێ و لادێییەکان بوو. هۆی کوشتنی بەدلیس بۆ ئەو ووتەیەی دەگەڕێتەوە کە دەیووت:"با شەڕ بکەین، بەڵام پێویست بەوە ناکات بەو ئەندازەیە گوند بۆش بکەین". بەڵام گورەش و کودەتاکارەکان دەیانووت:"هەر کەسێکی بکەوێتە ئەم کارەوە پاکتاوی دەکەین؛ گوندەکانیشیان لەسەر سەریان دەڕووخێنین". لەمیانەی کۆچبەری و راگوێزانی ئەرمەنیەکانیشدا ئەم رەوشە روویندەداوە. هەروەکو ئاگادارن، لە رێگای فشار هێنانەوە هەڵسان بە هاندانی رەوشی راکردنی و کۆچبەری.

**میهری بەللی:** ئەو دزی و رووتاندنەوە و دیاردانەی دەریش کەوتن لە رێگادا روویاندا. ئەو گەلەی (ئەرمەن) کە لە قیامەتی وەرزی زستانەوە رژانە سەر رێگاکان،...

**عەبدوڵڵا ئۆج ئاڵان:** بەڵام لە دیاردەی کورددا رووداوەکە مەرگەساتتر بوو؛ بە جۆرێك بەهەزاران گوندیان بە زۆرەملێ بەتاڵ کراوە و بەهەزاران تاوانی بکەری نادیار ئەنجامدراون. ئێستاکە سەرژمێری 3 ــ 4 هەزار دەدرێت. من

پێم وایە، لەمە زیاترە. ئەمە سەرژمێری شەڕی ناوخۆییە. لەمیانەی شەڕی رزگاریدا بەم ئەندازەیە مرۆڤ نەمردوون. من تەنیا مەبەستم گەریلا نییە، بەڵکو مەبەستم ئەو بێ تاوانانەشە کە لەپشتەوە بەشێوەیەکی نائاسایی و دڕندانە کوژراون. گەلێك کارسازان هەن، نەك تەنیا گوندەکانی کوردان، بەڵکو ئەو گوند و دەوڵەمەندە تورکانەی تا رادەیەکیش بێت پەیوەندیان بەکوردەوارییەوە هەیە پاکتاو دەکرێن. ئەمە رووداوێکی تاکە کەسی نییە؛ تەنیا رووداو و تاوانێکی کوشتنی تۆپاڵ (TOPAL) نییە. بەڵکو ئەمە هەوڵدانی پاکتاوکردنی سەرتاپاگیری توێژی سەروو و توێژە ژێرەکانی نەتەوەیەکە، بەجۆرێك جوگرافیایەکەشی وێران دەکرێت و دارستانەکانیشی دەسووتێنرێت.

بەڵێ، ئۆزال ئەم جۆرە کردار و نزیکبوونانە پەسند ناکات. فەرمانداری هێزەکانی ژەندمەرش ئەم پیلانە پەسند ناکات. سەرنج بدەن. لە دەستی ژەنەراڵ بەدلیسدا پیلانێك هەبوو، کەچی کاتێ دەکوژرێت پیلانەکەی لەگەڵ دەبێت! پاشان سیستەمی خۆی دامەزراند. لەڕاستیدا چیللەر تەواوی هێزی خۆی لێرەوە وەردەگرێت واتە لە ژەنەرال گورەش. هێزی ئاسایشیش هەتا بینەقاقای کەوتنە نێو ئەم کارەوە. دواتریش چوارچێوەی هێزە تایبەتەکان و پارێزەرانی گوند (جاشەکان)و دەسەڵاتی چەتەکان لەنێو پەرلەمان و بیرۆکراسیەتی دەوڵەت بەرفراوان دەبێت. ئاکام؛ بەکەوتنە نێو ساڵی 1995. لەڕاستیدا ئەم هەڵبژاردنانە، کودەتایەکی فاشیانەبوو کە بەپەلە جێبەجێکران. ویستیان لە رێگای ئەمەوە تەواوی ئەم کردارانە پەردەپۆش بکەن. بە راستیش گەلێك کەسی بەمە فریودا.

پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە: ئەمڕۆ چی روو دەدات؟ بەپێویستی دەبینین کە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە. ئایا دەزانن لەم قۆناخەدا ئێمە چیمان کرد؟ وەکو دەزانن سەرهەڵدانەکانی کورد لەمیانەی ساڵی 1990دا هەڵکشانێکی بەرچاویان بەخۆوە بینی، بەجۆرێك تەواوی کوردستان رابووە سەرپێیان. لەسەرتاپای شار و لادێکاندا رێپێوانی گشتی ئەنجامدرا. هێزەکانی گەریلاش لەئاستێکی مەزندا بەسوپابوونیان بەدیهێنا. لە ساڵانی 1991 ــ 1992دا سەرتاپای کوردستان لەنێو سەرهەڵدان و راپەڕیندا بوو، سەرهەڵدانەکان واتە جووڵانەوەی کوردی جموجۆڵ و خێراییەکی مەزنی بەدیهێنا. تورکیاش هەندێ پێشکەوتن و گۆڕانکاری بەخۆوە بینی، بزاڤی کرێکارانیش کەوتبووە نێو پەرەسەندنەوە، بەڵام تا ئەو رادەیەش بەهێز نەببوو. هەروەها چوارچێوەی تەقلیبوون بۆ نێو ریزەکانی گەریلا بەرفراوان بوو و بەگوێرەی وتەی ئەوان:"ئیدی کوردستانمان لەدەست

چوو"، کودەتا لە دژی ئەم بویەرە پێشکەوت. واتە ئەم کودەتایەی چیللەر ـ گورەش ـ ئینۆنو و دمیرێل لەدژی ئەمە هاتە ئاراوە.
وەکو دەزانن کودەتای 12ی ئادار لەدژی چەپ دەرکەوت ـ تا رادەیەکیش لەدژی هەندێ لایەنی نێو سوپادا رێبازی 9ی ئاداریش هەیە ـ بەڵام لە گەوهەردا ئامانج چەپ بوو، تا رادەیەکیش سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. هاوکات کودەتای 12ی ئەیلول بەئامانجی بنەبڕکردنی چەپەکان پێشکەوت. کەچی کودەتای چیللەر ـ گورەش یاخود با ناوی لێبنێین رێککەوتنی ئینۆنو ـ دەمیرێل و پەیوەندی بەهێزیان تەنیا لەپێناو بنەبڕکردنی سەرهەڵدانی نەتەوەیی کوردان بوو، بەجۆرێك دەمیرێل دەیووت: "ئەمە سەرهەڵدانی 28مینە و ئەمەش سەرکوت دەکەین و لەناوی دەبەین". ئەمەش لەدژی گەریلا بوو کە ئەوکاتە زۆر بەرفراوان ببوو. هەربۆیە دەتوانین بڵێین: لە راستیدا ئێمە بەهاتنی ساڵی 1990 کەوتینە نێو قۆناخێکی زۆر مەزن لەتێکۆشانی رزگاری نەتەوەییدا لەدژی کودەتاگەرە فاشیەکان یاخود رژێمی فاشی کە دەکرێ ناوی بنێین بلۆکی فاشی. وەکو دەزانن لە ساڵانی 1990 ـ 1991 ـ 1992دا کۆکوژی لیجە و نوسەیبین و بەدەیان شار و لادێی دیکەشیان کردووە. بەجۆرێك بەهەزاران بەدەستی کودەتاگەرەکان کوژران. ئەوە من نیم کە ناوی تاوانی بکەری نادیاری لەم تاوانانە ناوە. بەهەزاران مەدەنی لە ژن و منداڵ لەشار و لادێی کوردستانی وەك لیجە، جزیرە، شرناخ، نوسەیبین و... هتد کوژراون.
**میهری بەللی:** ئەم قۆناخە ببووە قۆناخی کوشتنی بێ دادگایی رۆژئاوای وڵاتیش. بۆ نموونە هەمموو شەوێ لە تەلەفزیۆندا تاوانی خوێناوی نیشان دەدران، پۆلیس خانوو و بینایان گەمارۆدەدا بەبیانووی ئەوەی کە لەنێو ئەمانەدا خەباتگێری DEV ـ SOL یان ئەندامی رێکخستنی چەپی تریان تێدا هەیە، ئەوکاتە نیشانچیەکان و هێزی تایبەت جێگەی خۆیان لەسەر خانوو و شوێنی ستراتیژی دەگرت لەژێر پاراستنی گروپێك لە ئەندامی MHPی فاشیست و کامێرەکانی کەناڵە تەلەفزیۆنیەکان. هەمموو کاتێکیش سەرۆکی ئاسایش "نەجدەت مونزور" کە دواتر بووە وەزیر ئەو بۆخۆی ئەو کێومالانەی بەڕێوەدەبرد. ئەم مونزورە لە شوێنی خۆیدا بانگەوازی دەکرد کە:" ئێوە لەهەمموو لایەکەوە گەمارۆدراون، خۆتان رادەست بکەن". ئەم تابلۆیە هەمیشە دووبارە دەبۆوە. دواتر دەنگی فیشەك دەهات و بەم دەنگەشەوە جەلادەکان یەکسەر دەکەوتنە جموجۆڵەوە و نارنجۆکیان دەخستە نێو ئەو خانووانەی کە گەمارۆدرا بوون و یەکسەر دەست درێژیان لەم خانووانە دەکرد. لە کۆتاییدا دەکەوتنە نێو ئەو خانوو یان بینایانە. ئەو

شتەی کە سەرەتا دەیانکرد، ئەوەبوو کە ئەو مرۆڤەی بەساغی بەردەستیان دەکەوت یەکسەر دەیانکوشت و پاشان لەتەك هەر لاشەیەکدا، ئەمەش ئەگەر پیاو یان ژن بێت، چەکێکیان دادەنا. دواتر یەکسەر رۆڵی کامێرەکان دەهات. لەسەر ئەم بنەمایەش هاندەرانی فاشیستەکانی ئەندامی MHP دروشمیان دەهاوێشت لە دەرەوەی ئەو خانووانە بۆ پۆلیس و کارە پاڵەوانیەکانیان. ئەم سیناریۆ و تابلۆیە هەمیشە لە تەلەفزیۆندا دووبارە دەکرایەوە. ئەمەش مسۆگەر بوو کە ئێمە رووبەرووی کودەتایەکی فاشیانە دەبینەوە لەژێر عەبای پەرلەمانەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ.... رووداوەکانی گەڕەکی غازی عوسمان پاشا و کۆکوژی سیواس دەبنە ئەڵقەی ئەو زنجیرەیە. بەم پێیەش پێویستە ئێمە لەو کۆکوژیەی کە دەرهەقی میللەت کراوە هەر لە رووداوەکانی کوشتنی وەداد ئایدن و ئەو شاعیر و هونەرمەندە میلییانەی کە بوونە ئامانجی ئەم کودەتایە، سەیر بکەین. بەداخەوە نوسەرێکی هۆشمەند دەرنەکەوت و نەیووت:"ئێمە رووبەرووی کودەتایەکی مەزن و مەترسیدار و پیلان بۆدارێژراوین، ئەمەش ناوچەکە (کوردستان) لە بنچینەوە لەنێو دەبات و دەڕووخێنێ". بەلام لەشوێنی ئەمەش چ جێگەی گرتەوە؟ رووداوی تۆپاڵ (عومەر لوتفی تۆپاڵ) و هەندێ رووداوی تریان ئەنجامدا. رووداوی نائاسایی و ئاوارتە. ئەم شێوازی شرۆڤەکردنەش تاوەکو ئێستاش بەردەوام دەکات، ئەمەش هەڵە و چەوتیەکی زۆر گەورەیە، من هەموو رووداوێك بەمێژووی خۆیەوە باس دەکەم، بۆئەوەی مسۆگەر بکەم کە ئەم قوربانیانە بەڕەنگێکی بەپیلان و بەرنامە بۆ دارێژراو بەئامانج کراون.

چونکە من شەڕی ئەو کاتەم بینی و بۆخۆشم تێیدابووم و دەتوانم ئەنجامی ئەوان بەڕەنگێکی ئاشکرا باس بکەم. ئێمە لەدژی ئەمە شەڕمان کرد، بەلام ئەوانیش شەڕی ئێمەیان کرد، ئایا دەزانن لەژێر چ دروشمێك ئەمانەیان کرد.؟ ئەمانەیان لەژێر دروشمی:"دەریا وشك بکە، بۆ ئەوەی گەریلا لەنێو ببەی" بەڕێوەبرد. لێرەدا مەبەست لە دەریا چییە؟ دەریا، گەل، لادێکان و رۆشنبیران بوون. "بەم جۆرە دەریایان وشك کرد" هەر بۆ ئەمەش هەر کەسێك لەدژی کاروباری نێو دەوڵەت رادەوەستا، هەموویان پاکتاودەکران.

**میهری بەللی:** کارەساتی لەمجۆرە لە ڤێتنام و یۆنانیش بەڕێوەبران.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەلام لێرەدا شێواز زۆر سەیرە، من لەسەرەتادا دەمەوێ ئەم شتانەتان بۆ روونبکەمەوە. ئەوان هەوڵدەدەن هەمووشتێك بشارنەوە؛ راستی رووداوەکان ئاشکرا ناکەن، چونکە تەواوی ئەوان دەستیان لە تاوانەکاندا هەیە و بەشدارن. وەکو ئێوە دەزانن، گوتیان:"حکومەتی یەکێتی نەتەوەیی ـ

حکومەتی ئینۆنو ـ دەمیرێل شەڕی سەرتاپاگیریان لەو قۆناخەدا سەپاند. بەئاواکردنی حکومەتی یەکێتی نەتەوەیی ڕەوشی ئاوارتەیان لەهەموو شارێکدا ڕاگەیاند، لە ئاستێکدا کە کەسێك نەما لە دەرەوەی ئەمە بمێنێ. باش بەبیرتان دێتەوە کە چۆن لە جەنازەی کوژراواندا بەو دروشمانەی کە گوێی مرۆڤیان کەڕ دەکرد، لەدژی PKK و کورد دەووتەوە. ئەنجام: دەسەڵاتدارێتیەکی فاشی لەژێر کۆنترۆڵی بیرۆکراسیدا لەهەموو ڕوییەکەوە، دامەزرا.

لەوانەیە بپرسن ئاخۆ بۆچی بەتەواوی سەرنەکەوتن؟

یەکەم؛ ئێمە بەپێداگرییەوە بەرخۆدانیمان کرد و بەهۆی ئەم تێکۆشانەوە لەسەر پێ خۆمان ڕاگرت. من بووم کە ئەم شەڕەم بەڕێوەبرد، لە ڕاستیدا بەرخۆدانیەکی زۆر دژوار و سووربوونێکی زۆر مەزن بوو. ژەنەراڵ گورەش زۆر بەباشی دەرکی بەمەکرد، من بۆخۆم لە تەلەفزیۆندا بینیم کە جارێك قسەی دەکرد و سەری خۆی دەهەژاند و دەیگوت:"ئەگەر خەباتی ئەو لە ڕۆژهەڵاتی ناوین نەبوایە ـ باسی منی دەکرد ـ هەمووشتێك بەخێر تەواو دەبوو" ئەو باش لەمە تێدەگات و من بەئاستەنگی سەرەکی دەبینێ لە ڕێگای خۆیدا، چۆن من لە ڕۆژهەڵاتی ناوین بڵندبووم و پێشکەوتم.

دووەم؛ تاکە ڕێگای سەرکەوتنی وەکو ئەم کودەتایانە چییە؟ پاکتاوکردنی سەرۆکی ئەو ڕێکخراوانەیە کە لەدژی ئەوان شەڕدەکەن. لەبەر ئەمەیە کە گەلێك کەسیان ڕەوانەکرد، بەتایبەت پەروەردە کرابوون، بۆئەوەی من بکوژن. پاشان بڕێکی گەورەیان لە TNT بەکارهێنا بۆئەوەی بەئامانجی خۆیان بگەن. تاوەکو ئێستاکەش لە هەوڵداندان و کاری هەرە چڕیان لە ساڵی 1992 ـ 1995 ئەوەبوو کە من بەئامانج بگرن. لە ناوەوەشدا بەسەدان هەڵمەتی کێوماڵیان بەڕێوەبرد بۆئەوەی گەریلا پاکتاو بکەن. بەڵام بەئامانجی خۆیان نەگەیشتن. هەروەها بۆ پاکتاوکردنی سەرۆکیش بەئامانج نەگەیشتن. لەسەر ئەم بنەمایە، من ئەمە وەکو کودەتایەکی شاراوەی بێ ناو لەقەڵەم دەدەم. قۆناخی دەسەڵاتدارێتی دۆغان گورەش زیاتر لە 4 ساڵ درێژەی نەکێشا. ئەگەر ئەمەش بەردەوام بوایە، هەمووشتێك لەنێو سوپادا سەروبن دەبوو. ئیدی بێزاری دەرکەوتە ڕوو، حوسین ئۆغلۆ و کەسانی وەکو ئەمە بەڕەنگێکی زۆر ئاشکرا دەیانگوت:"هەقی ئێمەیان خوارد و قانونیان سەروبن کرد". بێگومان ئەم قسانە ڕاست بوون. دەرکەوتنی ڕق و کین بووە شتێکی مسۆگەر. لەڕاستیدا لەنێوبردنی ژەنەراڵ بەدلیس و چالاکی لەنێوبردن و کوشتنی بێ هۆکار بێزاربوونی لەنێو ریزەکانی ژەندرمە دروست کرد. ئەو قەرەباڵخیانەی کە ژنی (عقید) ئۆزدان کردی، سەرچاوەی خۆی لەبێزاریەکی زۆر قووڵەوە دەگرێت. ئایا دەرك بە دووركەوتنەوەی سیاسەتمەداری مەدەنی لە حکومەتی

یەکێتی نەتەوەیی کرا؟ وەکو دەزانرێت رەوشی گورەش کاریگەری لەسەر تەواوی دەوروبەری خۆی دانا، دیسان لەوێدا تێکۆشانی شێلگیری ئێمە، لەوانەش گرنگتر لەوێدا کێشەی چەتە کە لەنێو حکومەتدا جێگەی خۆیان گرت و هەموو کاروباری هەستیار و داهاتی ئابووریان بەڕەنگێکی ناڕەوا گرتە دەست، سەرباری تالانی زۆرەملێ لە کوردستاندا، بێگومان پێویستە بازرگانی مادده بێ هۆشکەرەکانیش لەبیر نەکەن. ئەم رەوشە بەئاستێك گەیشت کە تەسلیمکارێکی زۆر سادە، بوو بە ملیاردێر. هەر کەسێك چەکی لە دەوڵەت گرت و رووی لە دزی کرد و پارەیان کەڵەکەکرد.

رەوشەکە بەمەوە نەوەستا، لەوە زیاتر دەستیان لە بازاڕی خۆشیان بەردا و قەیرانی دەوڵەت گەیشتە ئاستی هەرەبڵند. تەنیا دەتوانین بڵندبوونەوەی قەیران و تەنگژەی ئابووری ئاماژە پێبکەین کە کۆمەڵگا گەیشتە ئاستی بێزاربوونێکی هەرە بڵند. کەس نەما کە بەرگەی درێژبوونەوەی ئەم کودەتایە بگرێت. پەسندکردنی درێژبوونەوەی ئەم کودەتایە لەسەر ئەو قسەیەی کە تانسۆ چیللەر وتی: "لەڕاستیدا من بەتەواوەتی گەیشتمە سەرکەوتن، یەڵمازیش رووەو لەنێوچوون هەنگاوی دەهاوێشت و ئەجەوید ئیدی کۆن ببوو"، ئەمانە بەتەواوی قسەی چیللەر بوون. بەڵام سەبارەت بە CHP خۆی لەخۆیدا بەرەو ساڵی 2000 دەچوو و دەیخواست لەگەڵ MHP رێك بکەوێ و، تاوەکو ئێستاکەش ئەم مەیلەی CHP بەردەوامە و ئەمە بە چ واتایەك دێت؟ بەو واتایە دێت کە دەیخواست دەسەڵاتی خۆی تاوەکو دوای ساڵی 2000یش درێژە پێبدات. بەڵام هێزی CHP بەشی ئەمەی نەکرد. من هۆکاری ئەمەم بۆ ئێوە روون کردەوە. سوپا لەم شتە زۆر بێزاربوو و لە دژی هەموو ئەو پێشێلکاریانەی دەرەوەی یاسا و هەڵوێستی دەرەوەی ماف کە لەهەموو جێگەیەك بڵاو ببۆوە راوەستا.

**میهری بەللی:** واتە ئایا دەکرێ بووترێ:"دەست تێوەردانی سوپا، رێگای لەپێش کودەتای فاشیست گرت"؟

**عەبدوللا نۆچ تالان:** من قوولایی ئەمە نازانم، تائێستا لێکۆڵینەوە و لێتوێژینەوەی من سەبارەت بەم بابەتە بەردەوامە. ئەو شتەی دەبینرێ لەنێو سوپادا گەلێك مرۆڤی بێزار لەبەرامبەر رەوشی هەنووکە هەیە. ئەمانە بریتین لە قەیرانێکی خنکێنەر لەسەر تەواوی ئابووری و، تورکیای خستە نێو قەیرانێکی کۆمەڵایەتی و بووە هۆکاری دەرکەوتنی کێشەی جدی ئابووری. وێڕای ئەمەش ئەو فشارانەی کە ئەوروپا رۆژانە بەڕێوەی دەبرد و دەیووت:" ئەگەر ئێوە ئەم کارە بکەن، ئەوا لە ئەوروپا ئێوە پەسند ناکەین". سەرۆکی ئەرکانی ئێستای سوپا (ئیسماعیل قەرەدای) ئەو پیاوێکی ئەوروپایە و

بەتایبەتیش ئەڵمانیا، سەرەڕای ئەمەش پێی دەڵێن:"ئەگەر ئێوە لەنێو ئەم رەوشە بمێنن، ئەوا ئێوە لە یەکێتی ئەوروپا پەسند ناکەین". ئەمە شتێکی روون و ئاشکرایە. سەرباری ئەمەش سەرمایە گەیشتە خاڵی بنبەستبوونی یەکجارەکی، بێزاربوون گەیشتە ئاستی هەرە بڵند، بازاڕی کوردستان بەتەواوی گیرا، بەتایبەت کشتوکاڵ و ئاژەڵداری. تەواوی ئەمانە بەیەکەوە قەیرانێکی خنکێنەر پێکدەهێنن، کە هیچ حکومەتێك ناتوانێ بەرگەی ئەم رەوشە بگرێ. بە راستی بەرهەڵستکاری دەستی بە نارەزایی خۆی کرد و ئەو پارتیانەی کە ئاماژەمان پێکردن دەڵێن:"ئەگەر ئێمە ناخوازین تا دوارادە لەنێوبچین، دەبێ لەبەرامبەر ئەم رەوشە بەربەرەکانی بکەین". وێڕای ئەمەش دەنگی سوپا بەرزبۆوە. چەتەگەری گەیشتە ئاستێك کە هەرەشە لە ژیانی هەموو کەسێك لەکۆمەلگادا بکات، ئەمەش وایکرد، بەرهەڵستکار زیاتر پەرەبستێنێ. وابزانم ئەو شتانەی کە سوپا لەم خاڵەدا جێبەجێی کردووە، هاوشێوەی رەوشی تەنگی سوپا دەبێت کە رووبەڕووی دەبێتەوە، ئەم شتە دەرکەوتنێکی نوێیە لە شانۆی مێژووی رۆژەڤی سیاسی لە تورکیا؛ لەبەر ئەمەیە کە بە سەرنجەوە ئەم رەوشانە چاودێری دەکەم، لێرەشدا لایەنی سەرنج راکێش دەردەکەوێتە روو.

**میهری بەللی:** لەلایەنێکەوە ئەمە شتێکی ئەرێنیە....

**عەبدوللا ئۆج ئالان:** شتی سەرنج راکێش ئەمەیە: تورکیا کەوتە نێو گرنگترین قەیران لە مێژووی خۆیدا. سیاسەتمەدارە مەدەنییەکانیش ئەم رەوشەیان زیاتر قووڵ کردۆتەوە، لە شوێنی ئەوەی چارەسەری بکەن، سوپاش بەڕەنگێکی قرێژ کەوتەنێو ئەمەوە. لەسەر ئەم بنەمایە سوپا کەوتە جموجۆڵەوە وەکو هەموو قۆناخە مێژووییەکانی تر. ئایا سوپا، بەتایبەت گورەش پەیوەندی بەم کودەتا فاشیانەیەوە نەبوو؟ ئەو بۆخۆی سەرۆك ئەرکان بوو و لەهەمانکاتدا ئەویش کەوتە نێو هەمان قەیرانی خنکێنەرەوە. هەربۆیە پێم وایە ئەو پێشکەوتنەی لەنێو سوپادا دروست دەبێ زۆر جیاوازە، ئەمەش نابێتە قۆناخێکی نوێی بلۆکی فاشی ـ چونکە ئەم رەوتە رەنگە قەیرانی تورکیا گرانتر بکات ـ بەڵام ئەمە پێشکەوتنێکە ئەنجامی ئەرێنی لەگەڵ خۆی دەردەخات، زیاتر لەو دوو کودەتایەی 27ی گولان. دیارە کە ئەمە بەشێوەیەکی باش بەرنامەی بۆ دارێژراوە، هەرچەندە خاوەنەکەی نەناسراوبێت. من وای دادەنێم کە ئەمە دەستێوەردانێکی نموونەییە، رێبازێکی جیاواز بۆخۆی دادەنێ و، تەواوی سیاسەتی خۆی ئامادەکراوە، تەواوی ئامادەکارییە پڕوپاگەندەییەکانی ئەمە ئەنجامدراوە و هەنگاوی تاکتیکی، بەڕەنگێکی کاریگەر، پراکتیزە دەکرێت. بۆ نموونە:"وەك

قەدەخەکردنی پارتی رەفا و خستنی تانسۆ چیللەر" دەبینم. من ئەم شتە وەك کودەتایەك نا بەڵکو وەك رەنگێکی پرۆگرامی سیاسی پەسنددەکەم.

**میهری بەللی:** بەواتایەك لە واتاکان دەبێتە رێگر لەبەردەم کودەتای فاشیانە.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** جووڵانەوەیەکی ئاستەنگ کردنی فاشیانەیە یان کەم کردنەوەی خێراییەکەی و دانانی ئەلتەرناتیف بۆی.

**میهری بەللی:** لەمەشدا پڕوپاگەندەی کلاسیکی ئەربەکان و هەروەها چیللەریش دەخوازن کە ئاستەنگ بن بۆ دەرکەوتنی ئیرادەی زۆرینەی بەرهەڵستکار کە لەبەرامبەر ئەم پڕوپاگەندانە دەردەکەون و، بەکارهێنانی ئەوە وەك ئیرادەی زۆرینەی بەرهەڵستکاری ئەم کودەتا سەربازیە لەبەرامبەر زۆرینەی باڵادەستی لە پەرلەماندا. ئەمە قۆناخێکە بەتەواوەتی هاوشێوەی قۆناخی مەندەرێسە، کە هەوڵیدا ئۆپۆزیسیۆن بە رێگای زۆرینەی پەرلەمان لەنێو ببات.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** بەهەمان شێوەیە.

**میهری بەللی:** دوای ئەوە، کۆمەڵگای تورك هەندێك گرانەوەی بەخۆوە بینی. لەهەمان خاڵێشدا لێکچوواندنێکی زۆر مەزن هەیە و لێکچوونێکی سێیەمیش لەم خاڵەدا بەدی دەکرێت کە: زۆرینەی پەرلەمان و ئەو ئیمزایەی کە کۆکرایەوە، ئەوە دیاری دەکات کە نوێنەرایەتی لە زۆرینە ناکات، پاشان بەشێك لەوان چوونە ناو ریزەکانی لایەنەکەی تر.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** لێرەدا ئەمە راستە.

**میهری بەللی:** بەداخەوە هەندێك نووسەر کە خۆیان بە پێشکەوتووخواز دانا، ئەوانیش لەم کەموکورپیەدا بەشداریان کرد بەبیانوی دەست تێوەردانی سوپا و... هتد

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** بەڵێ، لە بەرامبەریان رانەوەستان.

**میهری بەللی:** بەبیانوی پێداویستی بە دەسەڵاتدارێتی مەدەنی با هەموو شێوەیەك دروست ببێت.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** لەلای هەندێك کەس گەیشتە ئاستێك کە لەسەر دیموکراسیەتی رەفا قسەبکەن.

**میهری بەللی:** ئەمە لە کاتێك کە سەرۆکەکانی رەفا تا بیناقاقا لەنێو جەماوەری فاشیست خنکابوون.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** بێ گفتوگۆ، مسۆگەرە.

**میهری بەللی:** لێرەدا دەمەوێ مسۆگەر بکەین کە ئێمە ناخوازین لەسەر ئاینی فلان و فلان قسەبکەین.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** نەخێر، بەپێچەوانەوە ئەوانە بەڕەنگێکی زۆر فرێژ ئایین بەکار دەهێنن.

**میهری بەللی:** لێرەدا مەبەستم ئەوانەیە کە ئایین بەکاردەهێنن.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** بەکاریان هێنا و خستیانە خزمەتی فاشیزم.

**میهری بەللی:** بەتەواوەتی وەکو فرانکۆیان کرد.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** راستە.

**میهری بەللی:** ئاخۆ نیشاندانی هەڵوێستێکی دژە میلیتاریستیانە کەموکوڕیەکی لەوە مەزنتر هەیە کە مرۆڤ بەشداری ریزی ئەربەکان و چیللەر بکات، بێ ئەوەی تایبەتمەندی تورکیا لەبەرچاو بگیرێت و ئەو رۆڵەی کە سوپا دەتوانێ لە قۆناخی هەستیار ئەنجامی بدات.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** ئەمە راستە و لەگەڵ بیر و بۆچوونی تۆدام.

**میهری بەللی:** لێرەدا کێشەی سەرەکی، چارەسەرکردنی کێشەی کوردە. ناکرێ دیموکراسی لە تورکیادا پێشبکەوێ بەبێ چارەسەرییەکی رەوایانەی ئەم کێشەیە. کێ هەیە بەم کارە هەڵبستێت؟ بەڕێوەبەرایەتی مەدەنی و ئەوانەش کە لە پەرلەماندا لاف دیموکراتی لێدەدەن لە توانایاندا نییە چارەسەری بکەن و هیچ نیازێکیشیان نییە هەنگاوێك بۆ ئەم مەسەلەیە بهاوێژن و، من شتێکی لەمە جیاوازتر بەدی ناکەم. لەوانەیە یەك ـ دوو کەس هەبن، بەڵام لەنێو دەوروبەرە جەماوەریەکان و سیاسەتمەدارە مەدەنیەکان مرۆڤی بەم جۆرە نابینرێن. لەکاتێکدا ئەمە ئەگەر بخوازرێ چارەسەریش ببێت، ئەوا ئێستا لە رێگای دەست تێوەردانی سەربازیەوە بەئەنجام دەگات. چونکە لەنێو سوپادا مرۆڤی وەها هەن کە چواردە ساڵە لەنێو ئەم شەڕەدان و بەشێوەیەکی باش دەزانن کە ئەم کێشەیە چۆن وەرچەرخاوە و بۆتە قەیرانێکی خنکێنەر. هەست دەکەم لەنێو ئەواندا جموجۆڵێك هەیە. ئەگەر ئەم کێشەیە لەسەر بنەمای ئیرادەی هەردوو گەل و لەسەر بنەمای یەکسانی و ئازادی و یەکێتی و ئازادانە، لە چوارچێوەی نیشتمانێکی هاوبەش و بەیەکەوە ژیانێکی ئازادانە بەچارەسەری بگات، ئەوا لەپێش تورکیادا گەلێك ئاسۆی نوێ دەکاتەوە. ئێمە وەکو سۆسیالیست و نەتەوەیی نەگۆڕ لێرەدا مسۆگەر پشتگیری هێزە ئاشتیخوازەکان دەکەین و داوا لەکەسانی تریش دەکەین کە هەمان هەڵوێست نیشان بدەن. لەئێمە دەخوازرێت کە هەڵوێستی نەرم نیشان بدەین، بەڕەنگێك رێگری لەبەردەم داوای ئاشتی دەرنەکەوێت، لێرەدا هەڵوێستی ساختەی دژە میلیتاریزم پێویست ناکات.

ئێستا ئەم بابەتەم لەتەلەفۆنەوە بۆ هاوڕێیەکەم باسکرد: "لەمێژووی کۆماری تورکیادا، لە کۆتاییەکانی 1960دا، چەپ پێشکەوت ـ واتە ئەو

جووڵانەوەیەی کە چەپی مارکسی ڕێبەرایەتی بۆ کرد ـــ کە ئەمەش جووڵانەوەی لاوانی شۆڕشگێڕبوون، پێشکەوتنێکی بەخۆوە بینی و لەو قۆناخەشدا لایەنی بەرامبەر کەوتە نێو پاشکەوتنەوە". لەو قۆناخەدا ڕاستەوخۆ دژایەتی سوپامان نەدەکرد و یەکێك لە دروشمەکانیشمان ئەوە بوو:"سەرباز و لاوان دەست لەناو دەست لەنێو بەرەی نەتەوەییدا". هەندێك کەس ئەم دروشمەیان چەواشەکرد و کردیانە: "سوپا و لاوان دەست لەنێو دەست". من لە دروشمەکەدا "سەربازم" بەکار هێنابوو، کەچی گۆڕیبوویان بۆ "سوپا". ئەوکات نارەزاییمان نیشان نەدا، ئەمەمان ڕەتنەکردەوە و لە ئاکامیشدا ڕووبەڕووی هێرشەکانی سوپا نەبووینەوە. هەروەها لەنێو ڕیزەکانی سوپادا گەلێك کەس هەبوون کە لایەنگری جووڵانەوەی لاوان بوون. هەربۆیە ئامانجی یەکەمی کودەتاکەی 12ی ئادار پاککردنەوەی ڕیزەکانی سوپا بوو. لە تەلەفۆندا باسم لەوەکرد کە:"ئێستا لەبەرامبەر پێشکەوتنی وەهایین کە ئەو قۆناخەمان بەبیر دەهێنێتەوە". بەڵام ئەمجارە لەشوێنی ووتنی دروشمی: "سوپا و لاوان دەست بەدەست لەبەرەی نەتەوەییدا"، پێویست دەکات ئەم دروشمە بەرز بکەینەوە:"گەریلا و سەرباز دەست بەدەست لە وڵاتێکی هاوبەشدا" یاخود " وڵاتێکی ئازاددا".

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان**: بێگومان قۆناخ بەشێوەیەکی خێرا و گەرم و گوڕەوە لە پێشکەوتن دایە و زەحمەتە هەندێ ڕووداو و دیاردە ڕوونبکەینەوە. ئێمە ئەم هەڵسەنگاندن و شیکردنەوانە لە ڕێگای بەدەستەوەگرتنی هەندێ سەرەداوەوە دەکەین و ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش ڕاستینەی ئەمانەش ئاشکرا دەبن.

**میهری بەللی**: ڕێگایەکی دیکەی بەرژەوەندی نییە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان**: نەخێر، نامەوێ لێرەدا بەرنامەی ئاییندەتان بۆ شرۆڤە بکەم. بەڵام ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی ڕووداو و پێشکەوتنەکان بەهادارتر و گرنگتر دەبینم. ئەمە زۆر مسۆگەرە کە؛ تورکیا لە مێژووی خۆیدا لەنێو گەورەترین قەیراندا دەژی، پێویستە قۆناخی عوسمانیش لەسەر ئەمە زێدە بکرێت، هیچ قۆناخێك بەم ئەندازەیە باری قورس نەبووە. بێ دەنگ مانەوەی سوپا، لەبەر ئەم هۆکارە ناکرێ بیری لێ بکرێتەوە. چونکە لەمێژووی تورکیادا سوپا لەتەواوی قۆناخە هەستیارەکاندا هێزی سەرەکی و هێزی دەست تێوەردانی سەرەکی بووە.

ئێستا دەڵێن:"بۆچی مەدەنیەکان لە چارەسەریدا پشتگوێ دەخەن؟" ئەو مەدەنیانەی کە کێشەکانی تورکیا چارەسەر دەکەن کوان؟ ئەوانە خاوەنی هیچ مێژوویەك نین و شتێکیش بەدی ناکرێت کە ناوی لێبنرێت جووڵانەوەی مەدەنی. ئەوە ئاشکرایە کە پارتە مەدەنیەکان تا چ ڕادەیەك لە دەوروبەری

سوپا خول دەخۆنەوە. هەروەها دەستەی فاشی مەدەنی بۆ پێکهێنانی فەرمانەکانی سەرۆك ئەرکان لە رەوشی ئامادەدایە.

ئەگەر بێگومان پێشکەوتن دەربکەوێت، بێهودەیە لە دەرەوەی ئەو پێشکەوتنانەی ناو سوپا بیری لێ بکەینەوە و، بۆئەوەی بڕیاریش بەپێچەوانەی ئەو خاڵە و لەبەرامبەر راستیە مێژووییەکان رانەوەستێت. ئەو بیرکردنەوەیە و چاوگرتن لەرۆڵی سوپا لەوساتە چارەنووس سازانەدا، بیرکردنەوەیەکی خەیاڵییە و هیچ پەیوەندیەکی بەڕاستیەوە نییە، ووتنی"لە رۆژئاوا چارەسەری مەدەنی چۆن پێك دێت"؟ ئەو چارەسەییانە کامانەن کە لەئێستا و مێژووی ئەم گەلەدا پێکهاتوون و دڵنیاییان هێناوە...؟ لەبوارێکدا ئەمانە واتای تێنەگەیشتنە لە تورکیا و راستی چینایەتی و کۆمەڵایەتی و قۆناخ و تەرازوی هێزەکانی ململانێی سیاسی لە تورکیادا.... لەدوایدا ئەوەی دەیبینم کە من لایەنێکی ئەم شەڕە توندوتیژەم ئەوەیە کە: تورکیا بەقۆناخێکی زۆر گرنگ و هەستیاری مێژووی خۆیدا دەربازدەبێت و، ئەوەش بووبە بەڵگەنەویست کە لە رێگەی ئەو سیاسەتە کلاسیکیەوە ئەنجام ناگیرێت کە دەڵێت: لەناوی ببە و تەواوی بکە..! سوپا باشترین هێزە کە لەم راستیە تێگەیشت، لەپلەی دووهەمیشدا مەدەنیەکان دێن. بەڵام بەداخێکی گەورەوە لەم پرسەدا رۆشنبیرەکان و پارتە چەپەکان لە دوای ناوەندە سەرمایەداریەکان دێن. واتە دوای TUSIAD و لایەنە راستڕەوەکان، ئەمە راستیەکی تاڵە، ووتنی TUSIAD کە دەڵێت با بەڕوونی هەڵسوکەوت بکەین و راپۆرت لەسەر راپۆرت ئامادە دەکات، ئەمە لە گرانی ئەم تەنگژەیەوە دێت و، دەرکی بەو راستیە کرد کە ناتوانێت ژیان بکات ئەگەر پرسی کورد چارەسەر نەکات. بۆچی سوپا بەو شێوەیە هەڵسوکەوت دەکات...؟ چونکە هەستیارترین دەزگایە لە تورکیادا. بەتێڕوانینی من ئەفسەرە پایە بەرزەکان هەستیارترین توێژن بەرامبەر پرسەکانی تورکیا؛ وەکو دەزانن هەر لەلانکەدا ئامادە دەکرێن و، خاوەنی رادیکالترین هەڵوێستن، ئەگەر سوپا لەم مەسەلە تێنەگات، کێ لێی تێی بگات...؟ هەتا دوێنی دەیووت: دوای ئەوەی لەناوم برد چارەسەری دەهێنم، بەڵام دوای شەڕێکی دژواری چواردە ساڵی، ئەوە دەرکەوت کە ئەوەندە ئاسان نییە ئەو کارە پێك بهێنن. شتێك ئەناسن کە لەوە بچێت..؟ وەکو شەڕی فەرەنسایە لە جەزائیر و شەڕی پورتوغال لە ئەنگولا و مۆزەمبیق.

**میهری بەللی:** شۆڕشی قەرەنفەل.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** شۆڕشی قەرەنفەل شۆڕشی ئەفسەرە پایە بەرزەکانە، ئەفسەری سۆسیالیستی کافالهو سەرکێشی کرد.

**میهری بەللی:** بۆچی لە تورکیاش روونادات...؟ ئەزانن کە کەسایەتی سۆسیالیستی کافالهو سەرکێشی کرد کە لەگەڵ هەندێکی تریش لە کۆلۆنیەکاندا شەڕیان کرد و، هەموویان بەناو ئەو ئاگرەدا تێپەڕبوون.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لیبید جەنەڕاڵێکی روسیە لە ئەفغانستان بەشداری شەڕی کرد، روسیا بیخواستایە دەیتوانی چیچان لەسەر نەخشەی جیهان بسڕێتەوە، لیبید ئەوەی بەتەنیا چارەسەری نەبینی و، کاری کرد بۆئەوەی چارەسەری پێکبێت. هەڵسەنگاندنێکم کردبوو تیایدا روونم کردبۆوە بۆچی پێشکەوتنێکی بەو جۆرە لەتورکیادا دەرناکەوێت.. تەنگژەی لای ئێمە زۆر قووڵە، بەتایبەت لەبواری پەیوەندی تورکیا و کوردستان.. هۆکاری شیکردنەوەم بۆ پەیوەندی کورد و تورك لەسەردەمی پێشوودا بەشێوەیەکی فراوان و قووڵ، بۆ ئەوەبوو کە رێگا بکەمەوە بۆ کردنەوەی ئەو گرێ کوێرەیەی کە ئێستا لە تورکیا دایە، کەس ناتوانێت دابڕاو لە کوردەکان چارەسەری بۆ پرسەکان و شیکردنەوە بۆ مێژووی تورکیا پێش بخات، هەروەها زۆر ئاستەمە بەنکۆڵیٚ کردن و پەسەند نەکردنی کوردان چارەسەری بهێنیٚ، ئەمە تایبەتمەندیەکی گرنگە و پێویستە لەبیری نەکەین، ئەمڕۆ تەنگژە بیٚ سنوور قووڵ بۆتەوە و دەڵێن: "ئێمە هەر چوار لامان گیراوە و بەئاگر گەمارۆ دراوین"، ئەمەریکا بە بەردەوامی گرانی لەسەر دروست دەکات و فەرمانی پێدەدات کە کوردان لەناو ببە و بەمەش بەشێوەیەکی رەها تورکیا بەخۆیەوە گرێدەدات. تۆ بیربکەرەوە لەو کۆکوژییەی تانسۆ چیللەر پێی هەستا، هۆکارەکانی دەزانیت..؟ ئەوانە بۆ پێویستیەکانی سیاسەتی ئەمریکا بوو کە پاڵی بە تورکیاوە نا هێرشێکی هەمیشەیی بکاتە سەر کوردان و لە رێگەی بەکرێگیراوی خۆیەوە تورکیای بەخۆیەوە گرێدا. من زۆر خەمبارم لەبەر تێنەگەیشتن لەم راستیە بەشێوەیەکی فراوان و قووڵ. ئەڵێن بەکرێگیراوی CIAیە ئەزانن لەسەر دەستی ئەو چیان ئەنجامدا، بەکرێگیراوی CIA یان والیکرد هێرشێکی دژوار بکاتە سەر رۆشنبیران و سیواس و زەحمەتکێشان و خەڵکی عەلەوی و گەلی کورد بەیەکەوە. چی دەستکەوت، دەزانن...؟ تورکیا بەتەواوی نەبووە پاشکۆی ئەمریکا، بە پەیمانێك بەئیسرائیلی گریٚ نەدا..؟ ئەمانە هەمووی ئەنجامی ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەلایەتیە.

**میهری بەللی:** با هەندێك باس لە ئۆپۆزیسیۆنی مەدەنی بکەین.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** شتێکی نەگونجاوە کە سوپا بەو پێشکەوتنە کاریگەر نەبێت، لە گریانی دایکانی شەهیدان بڕوانن، سوپا ناچارە بەوانە کاریگەر ببێت، سەرمایەداران قیامەتیان هەستاند و راپۆرت لەسەر راپۆرت دەردەکەن

ناکرێت ئەوانیش کاریگەریان لەسەر نەبێت. زەحمەتکێشان لەناو قەرزدا خنکاون و خەریکە لەبرسان دەمرن.

**میهری بەللی:** نان هەر دەچێت بچووك دەبێتەوە.

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان:** بەرێژەیەکی سەرنج ڕاکێش. بەڕەنگێك فەرمانبەری چینی بۆرژوازی بچووك و ناوەڕاست پێویستیان بەنانێکە، بەرێژەیەك کە لەمێژووی تورکیادا بێ نموونەیە، وانییە؟

**میهری بەللی:** بێگومان

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان:** بێگومان لەبیرتانە "رێپێوانی مەنجەڵ و نان" لەمێژووی تورکیادا بۆجاری یەکەمە فەرمانبەر دەکەوێتە رەوشێکی بەو رەنگە، جوتیاری سادە دەبێت چی لێهاتبێ"! رەوشەکە بەرەو ئەوە دەچێت ببێتە هاربوونێکی کۆمەڵایەتی، ناخوازم بە بەفراوانی لەسەر ئەم پرسە بوەستم چونکە ئێوە باش دەزانن"تەنگژەکە دەرگا دەکاتەوە لەسەر کاردانەوە و نەفرەتێکی قووڵ". سوپا وەکو هەموو قۆناخەکانی تری مێژوو ئەم رەوشەی لە هەرکەس باشتر و فراوانتر بینی. لەپلەی دووەمیشدا کەسایەتیە سیاسیەکان دێن، لەکاتێکدا زەحمەتکێشان بەشەڕی رزگارکردن خەریکن، لەو تەنگژە قووڵەی کە لەئەنجامی ئەو شەڕە نەزۆکە داسەپێنراوەی سەرکوردان دەرکەوتووە کە هیچ ئەنجامێکی تیادا بەدەست ناخرێت. سەرۆکایەتیەکانیان لە ئەنجامی ئەو سەرسامیەی کە لە رەوشەکەیان گرت زۆر خەریك بوون. لەوانەیە بپرسن: رەوشی ئێستای تورکیا چییە؟ رەوشێکی نەزۆکە، لەناو گێژاوی ئەو تەنگژەیەدا خول دەخواتەوە، بە رەنگێك کە مرۆڤ سەری سووردەمێنێ، ئەمەش بەرهەمی شەڕێکە توانای سەرکەوتن تیایدا نییە. لەنێوان ریزەکانی سوپا و کەسایەتیە سیاسی و هێزە مەدەنی و کۆمەڵایەتیەکاندا توێژێك دەرکەوت و ووتی: بەسە... مەسەلە بەم رەنگە چارەسەر نابێت، بەڵام هەتا ئێستاش هوشیاریان زۆر تەواونەبووە و، نەیانتوانیوە بەرنامەیەکی روون دابڕێژن، تەنها چاودێری ئێمە دەکەن و دەخوازن لێمان تێبگەن.

---

(*) ئەم چاوپێکەوتنە لەسەرەتای تەمموزی 1997دا پێک هاتووە، لەپێش ئەوەدا بەماوەیەکی کورت، هەندێک کەس لەناو سوپادا دەڵێن ئێمە نوێنەرایەتی توێژێکی کاریگەر دەکەین و، کەوتوونەتە رەوشێک کە لەگەڵ سەرۆکی PKKدا دیالۆگ پێش بخەن، بۆئەوەی لە مەسەلەی کورد دا بگەنە

چارەسەرییەکی سیاسی و ئەم شەڕە قرێژە تەواو ببێت، وتوویانە ئێمە ئەخوازین دیالۆگێک ئەنجام بدەین، لەچاوپێکەوتنی سەرەتادا هەوایەکی باش دروست بوو، بەڵام هەتا ئێستاش ئەو کارە تەواو نەبووە،قسەکانی سەرۆکی گشتی PKK کە لێرەدا بەکاری دەهێنێ پێویستە وەک بەیاننامەیەک بۆ نەرم کردنی رەوشەکە هەڵبسەنگێندرێت.

**میهری بەللی:** ئەوانەی کە پێویستە بەرنامەیەکی بەو شێوەیە دابڕێژن لەپلەی یەکەمدا ئەو ئۆپۆزیسیۆنە کۆمەڵایەتیەیە کە هێزێکی مەزنە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەمەوێت لەسەر ئەوان قسەبکەم، بەڵام لەسەرەتادا رێم بدە مەسەلە تەواو بکەم.

**میهری بەللی:** تۆ دەست پێ بکە، ئەگەر پێویست بوو بەشداری دەکەم.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەم پرسە لەژێر ناونیشانێکی تر چارەسەر دەکەین، ئەوەی بۆمن گرنگە ئەو قۆناخی لەناوبردنەیە کە دەخوازم شیبکەمەوە، ئەم قۆناخە زۆر بەڕوونی دەڵێت: "بەم شێوازە ئەو پرسە چارەسەر ناکرێت" بەڵام چۆن چارەسەر بکرێت، دوو شێوازی چارەسەری هەن، یەکەمیان؛ لەپێشدا بۆم شیکردبوونەوە کە ئەویش هەڵسانی دەستەی فاشیە بەکودەتایەك وەك دەزانرێت لەگەڵ ئەوەی ئەم دەستەیە پشتگیری کودەتای 12ی ئەیلولی بەدەست هێنابوو، هەنگاوی بەرفراوانی هاویشتبوو و، هەستابوو بەپاکتاو کردنێکی فراوان کە سەرۆك ئۆزالیشی گرتبۆوە، بەڵام ئەمان ئەم تەنگژەیان گەورەتر کرد، لە ئەنجامی دڵتەزێنی ئەندامێتی گورەش بڕوانن لە پەرلەماندا، بەتەنها مایەوە و لەگۆشەگیریدا دەژی لەچیللەر بڕوانن کە DYPی هێنایە لێواری کەوتن، ئەمە ئیفلاسێکە بەهەموو ماناکانی ئەم وشەیە. کەواتە چارەسەری چۆن پێکدێت..؟ من تەنها بەو پێشکەوتنانەی گرێ نادەم کە لەناو سوپادا دەردەکەوێت، لەپێش هەرشتێك بەرخۆدانی بەشەرەفی ئێمە هەیە، کە تەنها بەرخۆدانێکی نەتەوەیی کوردان نییە، بەهەمان رێژە بەرخۆدانێکی دیموکراسی بەشەرەفە بۆ گەلی تورك، لە پرسێکی جیاوازدا لەسەر مەسەلەی کاریگەری چەپ لەسەر ئێمە گفتوگۆ دەکەین. ژمارەیەکی زۆر لە لاوان هاتنە ناو ریزەکانمان لەژێر ناوی گەلی تورکدا. بەو واتایە رزگاری نیشتمانی کوردی لەهەمانکاتدا رزگاری تورکییە. بەتەواوی هەروەك چۆن لەبیستەکاندا زۆرینەی سەرۆکایەتی تورکی بوو کوردەکان هێزێکی یەدەك بوون و، لەپلەی دووەمدا دەهاتن ـ ئەمەش شتێکی جوان بوو جێگای شانازی و سەر بڵندی بوو ــ لە ئەمڕۆشدا سەرۆکایەتی گوێزراوەتەوە بۆ کوردەکان بەشداری هێزە دیموکراسیەکانی تورکیا لە ریزەکانیدا بەشێوەیەکی یەدەك بوو. لەسەرەتادا ئاماژەم پێکرد"دەکرێت سەربازەکانیش بەشداری تێدا بکەن...؟" کاتێك لە

رەوشی پراکتیکی ئەڕوانم، ئەبینم کە کاریگەری ئێمە لەسەر ریزەکانی سوپای تورکیا رەنگی داوەتەوە. لێرەدا لە خەونی گەڕان بەدوای موخاتەبێك لەنێوان سوپادا ناگەڕێم، بەڵام دەنگی بەباوەڕ دێتە گوێمان، پێش چەند ساڵێك بانگەوازییەکم کردبوو کە ناوەڕۆکەکەی بەم شێوەیە بوو:"پێویستی ناچار دەکات کە هەندێك ئەفسەری پایە بڵندی نیشتمانی لەنێو ریزەکانی سوپای تورکیادا دەرکەون" هەروەك چۆن لە وڵاتانی تریش روویدا. ئەمرۆ کاتێك ئەڕوانم ئەبینم کە پێشکەوتنێکی بەو شێوەیە روو دەدات، من خەیاڵی نیم، لەهەمانکاتدا دەمارگیریش نیم کە چاوی خۆم لە راستیەکان بگرم، من ناتوانم ببم بە ناسیۆنالیستێکی تەنگ. ئەمانە هەمووی پێشکەوتنی پۆزەتیفن. گومانی من ئەمەیە کە حکومەتی نوێ حکومەتێکی راگوزارە بێ هەرچەندە لە دەوروبەری سەنتەری هێزەکان دەخولێتەوە. لەسەر بناخەی ئەوانە ئەتوانین بڵێین: لە ئێستا بەدواوە ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی پێشکەوتن زۆر بەدەست دەهێنێ، ئەمەش لە پرسێکی تردا چارەسەر دەکەین. نەیانتوانی کوردان و PKK لەناو ببەن، بوونە چاوگی پێشکەوتنی گرنگ. لەم چوارچێوەیەدا شەڕی دوایی باشوور خاوەن گرنگیەکی مەزنە. شەڕی تایبەت خواستی لەوێ بگاتە ئەنجام، بەڵام ئێمە زەبرێکی توونددمان لێ وەشاند. لە راستیدا خواستیان بە هاوکاری ئەمریکا مەسەلەکە لە باشوور تەواو بکەن و بگەنە ئەنجام، بەڵام ئێمە رێگەمان پێ نەدا، گەریلا سەرکەوتوو بوو، بەو شێوەیەش تەنگژەکە قووڵبۆوە و لەگەڵ هاتنی بلۆکی فاشیەکان کە تورکیا خواستی لەیەك پێکداداندا بگاتە ئەنجام، ئەو تەنگژەیە قووڵتر بۆوە. لەگەڵ سەرنەکەوتنی ئەو دەستەیەش قۆناخێکی نوێ لەسەر بناخەی چارەسەری سیاسی دیموکراسی دەستی پێنەکردووە؛ بەڵام هەندێ دەنگی بەهێز دێتە لامان، کە بێجگە لەوانە پێویستیەکی دەست لێبەرنەدراوە و ئێستاش بەگۆڕانکاری رۆژانەی خێرا دەستپێکردووە کە من ناوی "وەرچەرخانی مەزن"ی لێدەکەم. پێویستە لەسەر هەریەك لەئێمە باش تێبگات و گوێ بگرێ، کە بەقۆناخێکی وەرچەرخانی مەزندا دەرباز دەبین، وەك دەیبینن ئەوە وەرچەرخانی قۆناخێکی مێژوویی دوور و درێژە، وەرچەرخانێك کە سیمای تایبەتی خۆی هەیە، لە رابردوودا وەرچەرخان تەنیا لەناو دەوڵەتدا پێکدەهات و ناوی: شۆڕشی سەرخان، شۆڕشی چەواشەی لێدەنرا. ئەمانە زیاتر لە چوارچێوەی دەوڵەت و سوپادا پێکدەهات، ئێمەش بناخەی گەلێریمان بۆ زێدە کرد. PKK و گەریلاکانی بەمانای بناخەی گەلێری دیموکراسی دێن بۆ وەرچەرخان، هەروەها بەمانای بناخەی دیموکراسی بۆ گەلی تورك و نیشتمانی بۆ گەلی کورد دێت. بەو رەنگەش بناخەی دیموکراسی و

سۆسیالیستیە. زۆرن ئەوانەی کە لەناو سوپا و دەوڵەتی تورکیادا باوەڕیان هەیە کە ئەم وەرچەرخانە پێداویستیەکی گرنگە، دەنگی بەهێز دەردەکەون کە دەتوانین دەنگی ناوەندی سەرمایەشی بۆ زێدە بکەین، زەحمەتکێشان پێداویستی گرنگ بۆ ئاشتی و رزگاربوون لەو رەوشە باش دەبینن، بێگومان ئەمانە هەمووی ئەو مانایە نادات کە دەستە فاشیەکان پاکتاو کران و ئیتر تەواو بوون، بەڵکو پارتی رەفا بەباوەڕیەکی بڵند دەخوازێت وەك هێزێك لەناو دەستە فاشیەکاندا کاری خۆی بکات بەرێژەیەك کە خەریکە دەبێتە هۆکاری نانەوەی شەڕێکی نوێ. لەکاتێکدا دەستەی چیللەر DYP تائێستاش نەیدۆڕاندووە.

تائێستاش هەناسە بڕکێیانە و خۆڕاگری دەکەن. بەڵام MHP لەوانەیە هەندێك پێشکەوتنی ناوخۆیی بەخۆیەوە ببینێ، لەوانەیە سەرلەنوێ کار بکەن بۆ بڵندکردنەوەی بزووتنەوەی فاشیزم، بێگومان بزووتنەوەی فاشیزمی مەدەنی. لەناو هێزەکانی ئاسایشدا هەندێك سەر دەبینرێن کە تائێستاش هەموویان پاکتاو نەکراون. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا رووداوەکان بەخێرایی لەبەرژەوەندی وەرچەرخانی نیشتمانی و دیموکراسی دایە. وای دەبینم کە لەقۆناخی نوێدا دەستە فاشیەکان لەهەموو قۆناخەکانی تر زیاتر لاواز دەبن، ئەمەش نەخەیاڵە و نەهیوایەکی درۆزنانەیە. لەهەمانکاتدا ئەو قۆناخەیە کەتیایدا ئۆپۆزیسیۆنی گەلێری و شۆڕشگێڕی دیموکراسی و سۆسیالیستی تیایدا دەستەی چالاکانەی خۆیان بونیادبنێن. قۆناخێکە کە تورکیا لەسەر ئاستی سوپا و دەوڵەت خۆی تیادا پێك بهێنێت.

**میهری بەللی:** واتە بەو شێوەیە کارەکە بسپێرێتە سوپا.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** نەخێر، نەخێر لەهەمان کات کە پێویستە ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی خۆی بسەلمێنێ، لەم مەسەلەیەدا بێگومان پارتی کرێکارانی کوردستان بەرپرسیارێتیەکی بڵند دەگرێتە سەرملی خۆی و، بەهیوایە بەشێوەیەکی سەرتاپاگیر بەرۆڵی خۆی هەستێت. لەم چوارچێوەیەدا ئەتوانم بڵێم کە من قۆناخێك ژیان دەکەم هیواو باوەڕی زۆر دەدات.

ئەگەر دەخوازیت با هەڵسەنگاندنی لەمە بەدواوە تەرخان بکەین بۆ گفتوگۆ کردنی ئەو شێوازەی کە تیایدا ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی پێش دەکەوێت، هەروەها ئەو شێوازەی کە هاوپەیمانێتی لەگەڵ سوپادا دەیگرێتەخۆ. بێگومان ئەگەر رەوشەکە ئامادە بێت و، هەروەها شێوازی پێشکەوتنی هەردوو موخاتەبی کوردی و تورکی، ئەمانە لەژێر ناونیشانێکی جیاوازدا، بۆئەوەش ئەگەر بەشێوەیەکی کورتیش بێ ئەخوازم هەندێك لەسەر رابردووی چەپی تورك قسەبکەم، لەئێوە دەخوازم کە هەڵسەنگاندنێکی کورت

بۆ مێژووی چەپی تورك بكەن. دوای ئەوە هەڵدەستم بەگفتوگۆ كردنی ئەو شێوازەی كە تیایدا كاری گەلێری و پرۆگرامەكەی لەقۆناخی نوێدا پێش دەكەوێت. هەروەها ئەو تاكتیك و هاوپەیمانە فراوانانەی كە پێویستە لە چوارچێوەیدا جوڵە بكەین، ئێستاش گوێتان لێ دەگرم بۆئەوەی لەم لایەنەوە گفتوگۆكە تەواو بكەین و تیشك بخەینە سەر پرسە گرنگەكانی رۆژگاری ئەمرۆمان.

**میهری بەللی:** گفتوگۆ و دیالۆگ.

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** لەگەڵ دەست پێكردنی دیالۆگ زۆر ئەنجام دەردەكەون و زۆر شتیش روون دەبنەوە. ئەوكاتە دەتوانین هەنگاوی زۆر بەرفراوانتر بهاوێژین. بەهیوام كە پێشكەوتنەكان لەم رێگایەدابن لە كاتێكدا كە تواناكان لەهەموو كاتێك زیاتر لەبەردەست دان.

توركیا كەوتۆتە قۆناخێكی پێچەوانەی ئەو قۆناخەی كە تائێستا تیایدا ژیانی دەكرد، بۆ یەكەمین جارە توانا دەرەخسێت بۆ پێكهێنانی وەرچەرخان لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی نەتەوەیی و كۆمەڵایەتی، چونكە ئاسایی بوو كە سوپا هەڵسێت بە ووتنی وشەی فەرمی یەكەم و كۆتایی، بەبێ ئەوەی گەل خاوەنی دەرفەت بێت بۆئەوەی بەناوی خۆی سیاسەت بكات و ئەنجام بگرێت.

لێرەدا بەكورتیش بێت پێویستە هەڵسەنگاندنێك بۆ مێژووی بزووتنەوەی گەلێری كورد و تورك بكەین، پێویستە ئاماژە بۆئەوە بكەم كە من لەكاتی گفتوگۆ كردن لەسەر پەیوەندی تورك ـ كورد ئەو مەسەلەیەم كورت كردبۆوە. یەكەمین ئۆپۆزیسیۆنی كۆمەڵایەتی گەورە لەمێژووی توركیادا وەك دەزانرێت لەگەڵ هاتنی توركەكان بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەركەوت، لەگەڵ وەرچەرخانی توێژی سەرووی عەشیرەتە توركەكان بۆ میللەت و، گۆڕانیان بۆ هێزێكی دەسەڵاتدار لەژێر ناوی دەسەڵاتی سوڵتان و، زیادبوونی هەژاری توێژەكانی ژێرەوە و گۆڕانیان بۆ جووتیاری هەژار و دەستپێكردنیان بەخەباتێكی چینایەتی توندوتیژ لەژێر ناوی توركمان و، پاشەكشە كردنیان بۆ چیاكان بەتایبەت چیای تۆڕۆس لە ئەنادۆڵ و ناوچەی دەریای رەش و چیای كەناری ئیجە. جیاوازبوون لەقۆناخی سەلجووقی و عوسمانیدا، بەشێوازێكی بەرچاو سەقامگیربوو، ئاڵۆزیەكی كۆمەڵایەتی گەورە سەریهەڵدا. بۆ سەرهەڵدانی ئەو قۆناخە ئەتوانین سەرهەڵدانی بابا ئیسحاق بەنموونە بهێنینەوە كە بزووتنەوەیەكی گەلێری كوردی و توركمان بوو بەیەكەوە، هەروەها كەمە نەتەوەكانیشی تێدابوو، بەڕاستی سەرهەڵدان بوو، لەناوچەكانی سوروج، حەلەب دەستی پێكرد و بڵاوبۆوە هەتا گەیشتە ئورفا بەرفراوانیش بوو هەتا تۆقات و ئەماسیا دوای زۆری و هەوڵدانێك توانیان

لــەناوی ببــەن، هــەروەها ســەرهەڵدانی شــێخ بــەدرەدین کــە لــە دەســتپێکی کەڵەکــەبوونی دەســەڵات لەدەســتی عوسمانیــەکان دەرکــەوت، کــە گــوزارەی لــە کاردانەوەی گەلی هەژار و کەمەنەتەوەکان دەکرد و، بـەهۆی ئـەو پشـتگیرییەی لــە توێــژی کۆمەڵایــەتی ژێــر و ناوەڕاســت بەدەســتی هێنــا تــوانی ببێتــە سەرهەڵدانێکی گەلێری مەزن، زۆر دەیخواست یەکسانی پێك بهێنێت....

**میهری بەللی:** لەگەڵ ئەوانەشدا بۆ کەمە نەتەوەکان بەتەواوی کراوە بوو.

**عەبدوڵڵا تـۆچ تـالان:** راسـتە کەمینـەی مەسـیحیش تیایـدا بەشـداری کـرد، هـەروەها سـەرهەڵدانی بـەناوبانگی جەلالیـەکان هەیـە لەمێـژووی عوسمانیـدا. هـەموو ئـەم سـەرهەڵدانانە لەبەرامبـەر سروشـتی ناوەنـدێتی ئیمپراتۆریـەت دەرکەوتن، شانبەشـانی ئـەو تەنگـژە ئابووری و کۆمەڵایەتیانـە بـوون کـە لـەو کاتــەدا دەرکــەوتن، هــەموو ئــەنادۆڵی گرتــەوە. لــە راســتیدا ســەرهەڵدانی جووتیارەکانــە، هــەروەها بزووتنــەوەی کۆرئۆغڵـو هەیــە و زۆر بزووتنــەوەی تــریش هەنــە کــە لەســەر زمــانی شــاعیران و رۆشــنبیران باســکراوە. لەگــەڵ ژمارەیــەك لــەو ئیمارەتانــەی کــە خــۆ بەدەســتەوەدانیان پەســندنەکرد، وەك کوڕەکانی قارمان و کوڕەکانی رەمەزان، کە لەسـەر دەسـتی کوڕەکـانی قەرەجە کرایە شیعر و پەند، هەتا سەدەی نۆزدە ئەم رەوشە بەردەوام بوو.

بەڵام بۆ هەڵوێستی کوردەکان، ئـەوانیش بەشـدارییان لـەو سـەرهەڵدانانەدا کرد کە لەناوچەکانی نزیکی ئەوان دەستی پێکـرد. ئـەوەی گرنگـە بـۆ کـوردان ئەوەیەکە خۆیان بەدوور گرت لە توانـەوە و پـیس بـوون، بـەهای کولتـووری و کۆمەڵایــەتی خۆیــان زینــدوو هێشــتەوە و بــەڵکو زیــاتر پێشــیان خســت. بــە پێچەوانەی سـەردەمی کۆمـاری؛ کوردەکـان هـیچ پاشـکەوتنێکی کۆمەڵایـەتیان بەخۆیانــەوە نــەبینی، بــەڵکو قۆنــاخێکی پێشخســتنی بــەهاکانیان ژیــان کــرد، بەتایبەتی لەسەر ئاستی زمـان و کولتـوور. بـۆ نمونـە، لەسـەدەی شـازدەهەمین کوردەکان ئاسـتێکی کولتـووری پێشـکەوتوویان پێکهێنـا بەپلەیـەك بـوو کـەوای کرد ئەحمەدی خانی داستانی مەم و زین بەزمانی کوردی بنوسێت. بەو رەنگە راســتی کــوردی زینــدوو و چــالاك بــوو. لــە راســتیدا کوردەکــان خــاوەنی ئۆتۆنۆمیەك بوون، کە هەتا سەدەی نۆزدەهەمین بەردەوام بـوو. وەك ئامـاژەم پێکرد سەرهەڵدانەکانی سەدەی نۆزدەهەم بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەبەرامبەر ســەربازی زۆرەملــێ و گــرتنی بــاجی زۆرە، بەرێوبەرایەتیــە ناوخۆییــەکان دووچــاری ترســی لەناوچــوون و ســەرلەنوێ بیناکردنــەوەی بــۆ بەرژەوەنــدی موچــەخۆرانی ســوڵتان هــەبوو، هــەتا رۆژی ئــەمرۆمان ئــەم ســەرهەڵدانانە بەردەوامە وەك شێوازێکی شـەڕ بـۆ پاراسـتنی ئۆتۆنۆمیـە کۆنەکـە، بـەڵام وەك دەزانرێ ناتوانێت لەبەرامبەر دەسەڵاتی ناوەندی خۆی رابگرێت. لـە سـەرەتای

کۆماردا کە لەسەر بناخەی یەکێتی کورد ـ تورك بوو، هیچ سەرهەڵدانێك دەرنەکەوت. بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو پێشکەوتنەی کە: یەك دەوڵەت، یەك نەتەوە و دەسەڵاتی یەك پارتی کە بەدەسەڵاتی تاك گوزارەی لێدەکرێت، کاردانەوەکان گەشەیان دەکرد، کە لەساڵانی 1925 ـ 1940 بوون بە سەرهەڵدانی فراوان. ئامانجی سەرەکیشیان رەتکردنەوەی راستی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی کۆمار نەبوو، بەڵکو لەبەرامبەر هەڵوێستی نکۆڵی کردن بوو، هەرچەندە سەرۆکایەتیەکەی کلاسیك بوو لە شێخ و پێشڕەوی عەشایەری فیۆداڵی پێکهاتبوو، لە راستیدا خاوەن مۆرکێکی نەتەوەیی و دادوەرانە بوو. هۆکاری زۆر هەبوون بۆ سەرنەکەوتنی ئەم سەرهەڵدانانە گرنگترینیان، رێکخستنی پتەوی بەڕێوبەرە بۆژوازییەکان کە هێزی سیاسی و سەربازی خۆیان مەزن کردبوو، لەسەر ئەم بناخەیەش رێکخستنی عەشایەری کوردی نەیتوانی لەبەرامبەر بۆرژوازیەت خۆی رابگرێت، لەبەر ئەوەش سەرنەکەوتنی هیچ پەیوەندیەکی بەدادوەرییەوە نییە. هەرچەندە سەرۆکایەتیەکەی رۆڵی گێڕابێ لە سەرنەکەوتنیدا. ئەم سەرۆکایەتیانە دەیانخواست بەو بونیادە کۆمەڵایەتیە کۆنە سەرکەوتن بەدەست بخەن. پێویست بوو ئەم کارە بەهەنگاوێکی دیموکراسیانە پێك بێنن بۆئەوەی رێگە لەبەردەم کەوتن بگرن. بەو رەنگەش نەیتوانی ببێتە هەنگاوێکی نیشتمانی دیموکراسی راستەقینە، بێگومان بەسەرهەڵدانێك کە ئامانجی عەشایەری هەبێت سەرکەوتن بەدەست نایەت.

**میهری بەللی:** جیاواز لە قۆناخی بڵاوبوونەوەی شۆڕشگێڕی جیهانی.

**عەبدوڵا نۆچ تالان:** زۆر ئاساییە، ئەو قۆناخە سەرەتا و پێشکەوتنی بەرچاوی بزووتنەوە نیشتمانی و کۆمەڵایەتیەکانە، ئەمەش لەسەرهەڵدانە کوردیەکاندا کە خۆیان دەخواردەوە نەمان بینی، بەپێچەوانەی کەمالیستەکان کە کرانەوە لەسەر روسیای بەلشەفی، تەرازووی هێزەکان بەرەنگێکی بەرچاو لاسەنگ بوو، بەتایبەت دوای ئەوەی هێزی خۆیان گەورە کرد و جێگیر بوون، ئیتر ژێرکەوتن مسۆگەر بوو بۆ سەرهەڵدانە کوردیەکان، قۆناخی دوای ئەویش هەروەك دەزانین، قۆناخی بێدەنگیەکی تاریکە لەمێژووی تورکیادا، کە لەگەڵیدا تیرۆرێکی سپی لەئاستێکی فراواندا لەسەر هەردوو گەلی کورد و تورك بەیەکەوە بەڕێوە برا.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی تورکیش بەدەستێکی پۆڵاین لێی دراو بەتووندوتیژی تێك شکێنرا، وەك دەزانرێ لەسەرەتای بیستەکاندا بزووتنەوەی کۆمۆنیستی لەرێی پیلانگێڕی جیاوازەوە پاکتاو کرا، بەتایبەت پارتی کۆمۆنیست و بزوتنەوە گەلێریەکانی تر. لەبەر

ئەوەی رژێم داخراو بوو بۆ هەموو شێوازەکانی ئۆپۆزیسیۆنی بۆرژوازی، ئەمەش رێگای پێشکەوتنی لەتورکیا داخست، هەرچەندە چەند هەوڵدانێکیش هەبێ، بەڵام هەموویان بەدەستێکی پۆلایین لێدران و تێك شکێنران بەبێ ئەوەی پێشکەوتنێکی بەرچاو پێکبهێنن. راستە فیرقەی بڵندبوونی نەتەوەیی کۆمار و فیرقەی ئازاد پاڵێوراو بوون کە پێشکەوتنێك لەبواری ئۆپۆزیسیۆندا پێکبهێنن، بەڵام دیکاتۆریەت بەهیچ شێوازێك رێگەی پێنەدان. لێرەدا ئەزموونیDP هەیە. بەڵام وەکو دیاریمان کرد، زۆر پێویست پێشکەوتووخواز نەبوو، بەهۆی سروشتی چینایەتی، لەگەڵ ئەوەی کە پشتگیری گەلی بەدەست هێنابوو لەبەرامبەر دیکتاتۆریەتی تاکە پارتی، بەشێوەیەکی رێژەیش بێت سروشتی ئۆپۆزیسیۆنێکی گەلێری بەدەست خستبوو، واتە هیچ پەیوەندیەکی سەرۆکایەتیەکەی بە دیموکراسیەت و پێشکەوتنخوازیەوە نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا خاوەنی مانایەك بوو وەکو بڵێی ئۆپۆزیسیۆنێکی گەلێری بوو لەبەرامبەر دەستەی دەسەڵاتدار، لەکاتێکدا هۆکاری ئەوانە تەنها پشت بەستن بوو بەگەل، هەرچەندە لەبواری ئامانجەکانیدا خاوەنی ئەو مانایانە نەبوو، کودەتای 27ی ئایار وەك دەزانرێت کودەتایەکی سەربازییە و، هیچ پەیوەندیەکی بە ئۆپۆزیسیۆنی گەلێریەوە نییە، بەڵام کەش و هەوایەکی خولقاند بۆ پێشکەوتنی ئۆپۆزیسیۆنی جەماوەری.

گرنگترین ئۆپۆزیسیۆنی گەلێری لەمێژووی تورکیادا ئەوە بوو کە لە سالانی حەفتاکاندا دەرکەوت، کە تیایدا جەماوەر و چینی کرێکار و جووتیار و لاوە شۆڕشگێڕەکان جێگەی خۆیان تیایدا گرتبوو و، سەرەتایەکی زۆر بەهێزیان نیشاندا، لە راستیدا ئەم ئۆپۆزیسیۆنە "گرنگترین ئۆپۆزیسیۆنە لە مێژووی کۆماردا و جێگەی ستایشە"ئەوەی جێگەی باسە لەگەڵ لەدایکبوونی چالاکی رێکخستنی و ئایدیۆلۆژی لەگەڵ خۆیدا پێش خست، لەم قۆناخەدا کوردەکان بەشداریان کرد هەرچەندە بەشێوەیەکی لاوازیش بێت، بەتەواوی قۆناخێکی نوێ بوو، ئاسەوارەکانی هەتا رۆژگاری ئەمڕۆمان دیارە، نەیانتوانی لەناوی ببەن هەرچەندە دوو سێ کودەتای سەربازیان ئەنجامدا، کە بەهێڵکی گشتی شیمان کردەوە و ئەمەش بەسە. بەڵام سەبارەت بە رۆژگاری ئەمڕۆمان، ئەو پرسیارەی دێتە پێشمان ئەمەیە! ئەو ئۆپۆزیسیۆنە گەلێریەی ئەو پاشماوە مێژووییانەی هەیە، ئەمڕۆ دەتوانێت بواری سەرکەوتن بڕەخسێنێ بۆ ئەو ئۆپۆزیسیۆنە گەلێریە شۆڕشگێڕیە ـ نیشتمانیە ـ دیموکراسییە...؟ پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، پێویستە ئاماژە بە ئەگەری پێشکەوتنی چەپێکی سۆسیالیستی بکەین کە ببێتە مێژوویەك بۆ ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی لە تورکیادا، سەرەتا پێویستە بزووتنەوەی گەلێری کە بەشێوەیەکی بابەتی

گەشەی کردووە ببینین، بەرێژەیەك کە ناتوانین پێوانەی بکەین لەگەڵ هیچ کاتێکی تر لە مێژووی تورکیا و، ئەمەش بناخەیەکی پتەو و بەپیتە بۆ لەدایکبوونی گەشەکردنێکی مەزن، وەك دەزانرێت ئەگەر رەوشی بابەتی گەشە نەکات دەرکەوتنە شۆڕشگێڕیەکان پاکتاو دەبن، ئەوەی شایانی باسە کە رەوش لە تورکیادا بەتەواوی پێگەیشتووە بۆ دەرکەوتنێکی بەو رەنگە، تەنگژەیەکی خنکێنەر هەیە، کە ناتوانن رایبکەن، لە ئابوورییەوە دەست پێدەکات تا سیاسەت، تەنانەت دەربازی ریزەکانی سوپاش بووە، یەك دەزگاش نەماوە پێی کاریگەر نەبوبێ، تەنانەت یەك توێژ و یەك خێزانیش نەماوە کە هەڵنەوەشێتەوە و رێگەی خۆی ون نەکات و رۆژانە ئەناڵێنن، هەموو توێژ و چینە کۆمەڵایەتیەکان هەر لە ناوەندە سەرمایەداریەکان بۆ چینە زەحمەتکێشەکان لەژێر باری ئەو تەنگژە خنکێنەرە دان. لەکاتێکدا کوردستان لەناو شەڕێکی زۆر توندد بۆسالانێکە ژیان دەکات، کە بەگشتی ناوی "شەڕی سی ساڵ"ەی لێ دەکەین، واتە ئەو شەڕەی لەساڵی 1965 هەتا ئەمڕۆ دەستی پێکردووە، 15 ساڵی ئەم شەڕە لە تورکیادا مایەوە و 15 ساڵەکەی تریش لە کوردستاندا بەڕێوەچوو، من باسی رەوشی ئێستای ئۆپۆزیسیۆنی شۆڕشگێڕی نەتەوەیی دیموکراسی ناکەم، بەڵکو باسی بزووتنەوەیەك دەکەم کە بۆ ماوەی 30 ساڵە دابڕانی بەخۆیەوە نەدیوە و بەقارەمانانە بەرخۆدانی کردووە، پشتی کودەتای 12ی ئادار لێی درا، بەڵام بەتەواوی پاکتاو نەکرا، دوای ئەو کودەتای 12ی ئەیلول هات و ویستی کۆتاییەك بۆ ئەم ئۆپۆزیسیۆنە دابنێ، بەڵام ئەویش لەو کارەدا سەرکەوتوو نەبوو کە بگاتە ئامانجی کۆتایی خۆی، هەرچەندە زەبرێکی گەورەی پێگەیاند و هەندێك سەرکەوتنی رێژەیی بەرچاوی بەدەست هێنا، لەم کاتانەدا ئۆپۆزیسیۆنی نیشتمانی دیموکراتی لەکوردستان سەریهەڵدا و دەروازەیەکی فراوانی کردەوە، بەتایبەت بەپرەنسیپەکانی گەریلا کە نابەزێت، بەمەش بەهێزترین و گەورەترین سەرهەڵدان لەمێژووی دەسەڵاتدارانی تورکیادا دەرکەوت، هەروەك چۆن بن نەکەوت، ئەمڕۆ گەیشتۆتە ئاستێك کە تورکیا ناچار بکات وەرچەرخانێکی شۆڕشگێڕی گەورە پێکبهێنێت و، دەخوازێت تورکیا لەو تەنگژە خنکێنەرە دەربهێنێت کە ئێستا تیایدایە، ئەویش لە رێگەی شۆڕشێکی نیشتمانی دیموکراسی و، بۆ یەکەمین جار لەمێژووی پەیوەندی تورك ـ کورد دا بوار دەرەخسێت بۆ پێك هێنانی ئازادی و یەکسانی و، کەوتۆتە قۆناخێکی نوێ و هیوا باوەڕی لە رۆحدا پێش دەخات و پاڵێوراوە بۆئەوەی سەرکەوتنی بەرچاو بەدەست بخات. پێویستە ئەمە ببینرێت.

دەسەڵاتدارانی تورکیا چیان هەبو ووتیان: بە فاشیزم و هەموو شێوازەکانی، بەکودەتا، بە پیلانگێڕی، چەوساندنەوە و زۆرداری چیان لەدەست هات کردیان، بەڵام ئێستا ئەیانبینین، کە هەموو چەکەکانیان بەکارهێنا و دوایان پارتی رەفا بوو مۆرکێکی ئایینی هەبوو، بەبڕوای من ئەویش رۆڵی تەواوبوو و، لە رێگەی ئەو ناکرێت سەربکەون، ئەمە لەکاتێکدا کە بۆ ئێمە هەرچەندە زۆری و زەحمەتیش هەبێت، بەهێزترین چەکی خۆمان هەتا ئێستاش دەپارێزین. هیوای گەلەکەمان لە بەدەستهێنانی ئازادی و یەکسانی، لە رێگەی سەربەخۆی نیشتمان بێت یان سەرلەنوێ بیناکردنەوەی پەیوەندیەکانی، ئەمەش بۆتە داوایەك و کەس ناتوانێت لەپێشیدا بوەستێت و ئەمرۆ دەبێتە داوایەکی فەرمی، یان دەبێتە پرۆگرام، هێزە کۆمەڵایەتیەکان دەستیان بە بەرخۆدانی کرد، هەرچەندە بەشێوەیەکی بڵاویش بێت، ئەمەش لەناو ریزەکانی سوپا و هەموو توێژە کۆمەڵایەتیەکان رەنگی دایەوە، هەموویان یەك داوایان هەیە؛ دیموکراسیەت. بەو شێوەیە ئێمە ئەو ئاستە بەدەست خراوەمان لەئەنجامی ئەو رەوشە پێگەیشتوو و، لەسەر بناخەی داوای گەلانی ئێمە بۆ ئازادی و یەکسانی ئەو خەباتە مەزنەمان هەڵسەنگاند، بۆچی لەسەردەمی رابوردوودا بزووتنەوەی چەپ پێشکەوتنێکی بەو رەنگەی بەدەست نەهێنا...؟ چاوپێخشاندنەوەی ئەم مەسەلەیە و دیتنی هەڵە و کەموکورتیەکان ـ ئەگەر هەبێت ـ و دەربازکردن و دارشتنەوەی لایەنە راستەکان و پێکهێنانی بەڕێوەبەرایەتیەکی کوردیناسیۆن و پێداویستییە پراکتیکەکان بەشێوەیەکی بە پەلە، کارێکی حاشاهەڵنەگرە بۆ ئێمە و، وامان لێ دەکات کە زوو هەنگاو بەرەو سەرکەوتنی کۆتایی بهاوێژین. ئەم راستیە خرۆشانێك لە رۆحماندا دروست دەکات و رێبازێکە ناتوانین خۆمانی لێ لابدەین، ئەمەش راستی و هۆکارە بۆ ژیانمان.

دوای ئەم پێشەکییە کورتە، ئەگەر دەخوازن ئێوە بفەرمون، وێنەیەکی کورتمان پێشکەش بکەن لە رابردووی بزووتنەوەی سۆسیالیستی و ئۆپۆزیسیۆنی گەلێری، بەتایبەت کە ئێوە لەقۆناخی نزیکی رابردوودا ژیاون و رێبەرایەتیتان بۆ پێشکەوتنەکان کرد، گوێگرتن بۆ ئێوە تیشك خستنە سەر زۆر راستیە کە لەوانەیە لەلای ئێمە نادیاربێت.

**میهری بەللی:** هەڵوێستی نزیك بوون لە ئۆپۆزیسیۆن لەسەردەمی کۆماردا و، هەروەها لە هەردوو ئۆپۆزیسیۆنی چەپ و چەپی مارکسی و، هەڵوێستی چەوساندنەوە لە بەرامبەر سەرهەڵدانە کوردییەکان هەموو ئەمانە هەڵوێستی سروشتی دیکتاتۆریەتی تاکە پارتیە، دیکتاتۆریەتی بۆرژوازیەت، پێوانەی ئەو توندوتیژیەی پێکهات زۆر بوو، ئەمەش تایبەتە بەتورکیا. سەرچاوەکەی لە

رابوردوی مێژوویی تورکیاوە دێت.... دوای ئەمانە پێویستە بپرسین: هەڵەکانمان چین و لە کوێدان...؟ ئەمەش پرسیارێکە پێویستە لەسەری رابوەستین و وەڵامی بدەینەوە، چونکە هەڵوێستی: "ئێمە بەبەردەوامی توشی ستەم هاتین و بێ تاوان بووین" هەڵوێستێکی هەڵە و نەزۆکە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڕای ئێوە بۆچی بزووتنەوەی مستەفا سوبحی لەماوەیەکی کورتدا کۆتایی هات...؟ کێ لەمە بەرپرسیارە...؟

**میهری بەللی:** لەسەرەتادا پێویستە ئەم راستیە بزانین: مارکسیزم، یان سۆسیالیزمی زانستی کە بزووتنەوەی کۆمۆنیزم نوێنەرایەتی دەکرد، بناخەیەکی چینایەتی لەناوچەی ئەنادۆڵدا نەبوو، ئەو توێژەی پێی دەوترێت چینی کرێکار تەنها لەو ناوچەدا هەبوون کە لەژێر دەسەڵاتی رژێم دابوون وەك ئیزمیر. ئەستەمبوڵ و ژمارەیان دەیان هەزار بوو. لەگەڵ راکردنی تواناکانی ژیان لە وڵاتێکی کشتوکاڵی دواکەوتوودا کە چینی کرێکاری نەبوو، دەستکردنی بەبەرخۆدان لەسەرچاوەی پێداویستییە مێژووییەکان و لەژێر رێبەرایەتی بیرۆکراسیەکان، لە رەوشێکی بەم رەنگەدا و بوونی ژمارەیەکی کەم لە کەسایەتیە کراوەکان بۆ هزری هاوچەرخ کە زۆربەیان رۆشنبیر بوون، بزووتنەوەکەی وەها نیشاندا کە تەنها بزووتنەوەی ئەوانە، لەسەرەتادا بزووتنەوەی کۆمۆنیستی بناخەیەکی نیشتمانی نەبوو، ئەمە یەکەمین، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا نەدەکرا خۆیان لەپێکهێنانی هەندێك هەڵە بپارێزن. ئەوەی دەزانرێت پەیمانێکی بەرچاو هەیە لەنێوان شۆڕشی روسیا و شەڕی رزگاری، هەندێك رۆشنبیری بەتوانا هەبوون کە راستەوخۆ لەگەڵ لینین کاریان دەکرد، لەپێش هەموویان مستەفا سوبحی و هەڤاڵانی، کە هەستان بە چەکدارکردنی دیلەکان و ناردیانن بۆ ئەنادۆڵ.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** زۆرتر لەژێر ناوی لیوای بەلشەفیك دابوو.

**میهری بەللی:** بەڵکو لەوەش زیاتر... بەڵام با لەوە زیاتر زێدەڕۆیی نەکەین.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ووتت گەورە کردن...؟

**میهری بەللی:** با گەورەی نەکەین، با قەرەبەکر لەیاد نەکەین کە هەتا ئەو کاتەش بەسوپای سوردا هەڵیدەدا و، لە نووسراوەکانیدا بەتاکە هیوای دادەنێت. یەکەم؛ دەڵێت ئەوەی بکەوێتە ناو دەریا دەتوانێت مار بگرێت. دووەم؛ هەڵسانی ئەدهەم چەرکەس بەپێکهێنانی لیوایەکی بەلشەڤ بەکارێکی بێ بایەخ دەبینێ. چونکە ئەدهەم یەکێك لە کەسایەتیە دیارەکانی چەرکەسە و، دژایەتی هەیە لەگەڵ سوپای عوسمانی و مستەفا کەمال، باوکی مێردی بەهیچەبۆران (نوزاد هەفکویە)، کە یەکێکە لە پیاوەکانی ئەدهەم، کاتێك لە

یۆنان بوون هەندێك شتی نامۆم لێ بیست، ووتی: لە ساڵانی ئامادەییدا من لەنێو ریزەکانی بزووتنەوەی لاواندا بووم و، سۆسیالیزم پرسی سەرەکی من بوو،"من باش ئەو وتوێژانە دەزانم کە رویدەدا لەنێوان باوکم و ئەدهەم کاتێك لەماڵی ئێمە کۆدەبوونەوە، هەموو گفتوگۆکان ئامادە بووم، بەڵام من رۆژێکیش نەم بیست وشەی "سۆسیالیزم" تیایدا دەرباز ببێت، پەنابەری بۆ یۆنان بەمانای چییە..؟ وەك دەزانرێت یۆنان دەوڵەتێکی بۆرژوازیە، سیاسەتێك پەیڕەو دەکات کە لە دەوروبەری ئینگلتەرا دەخولێتەوە، دوایی ئەدهەم چووە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە لەژێر دەسەڵاتی ئیمپریالیزم دەیناڵاند، گرێدانێك لەنێوان ئەو دوو رەوشەدا هەیە، بەڵکو بەهیچ شێوەیەك نەیەتە زهنی ئێمەوە، ئەگەر تۆ پیاوێکی کە لیوایەکی بەلشەفیت دروست کردووە، با ئێمە بەلشەفیەتی تۆ ببینین. ئەمە مەبەستی من بوو بەووتنی: با مەسەلەکە گەورە نەکەین.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** واتە ئەو پارتی کۆمۆنیستەی کە مستەفا کەمال رێگەی دابوو....

**میهری بەللی:** شتێکی بەو رەنگە.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** شتێکی بەو رەنگە و لەوانەیە زاناتر لە ئەوەی تریان.

**میهری بەللی:** نەخێر، لەشاری ئەسکی شەهیر رۆژنامەیەکیان دەردەکرد ناوی "جیهانی نوێ" بوو، کە زمان حاڵی ئەدهەم چەرکەس بو و، سەرپەرشتیارەکەی عارف ئوروج بوو کە لە دواییدا لەکاتی فیرقەی ئازاددا بووە سەرپەرشتیاری رۆژنامەی "سبەی" کە نوێنەرایەتی ئۆپۆزیسیۆنی بۆرژوازی باڵی راستی دەکرد و دژی CHP بوو، من بەپێویستی نازانم ئەو رێکخستنانەی لەو سەردەمانەدا وەکو کارگ هەڵتۆقین و لەو راستیە کۆمەڵایەتیەدا لە قەوارەی خۆی زیاتری پێ بدەم، بەتایبەت کە هیچ کام لەوانە نەگەیشتنە ئەنجامی پێویست، ئەنجامی پێویستی لێ نەکەوتەوە. بەڵام بۆچی...؟ راستە جەماوەر لە رەوشێکی هەڵچووندا بوو، بەڵام بونیادی چینایەتی ئامادە نەبوو، هەربۆ ئەوەش ئەم هەڵچوونە زوو دەبێت و زوو دەکوژێتەوە. دەتوانین مەسەلەی مستەفا سوبحی بەم شێوەیە کورت بکەینەوە: ئەو نەیدەزانی کە پاشا عوسمانیەکان چەند کۆسپیان لە رێگایدا ناوەتەوە، ئەو وای باوەڕ دەکرد کە دڵسۆز بن بۆ ئەو پەیمانەی بەستویانە، دێت و وەك بڵێی تەسلیمیان دەبێت، ئەوە هیچ پەیوەندیەکی بەوشیاری شۆڕشگێڕییەوە نییە. وتەیەکی بەناوبانگی کۆرئۆغلۆ هەیە کە دەڵێت:"تەنها بە با دەرکەوتن لە مەسەلەکان تێ دەگەم".

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** هەستیارم بەرامبەر ئەو باڵندەیەی کە دەفڕێت.

**میهری بەللی:** پێویستە پێش ئەوەی فێڵ و تەڵەکەبازی دەربکەوێت هەستی پێ بکەیت، شۆڕشگێڕ بەو ڕەنگەیە، بۆ نمونە ئەگەر ئێوە بەو مەترسیانەتان نەزانیایە، کێ دەزانێ چیتان بەسەر دەهات. وتەیەکی بەناوبانگی لینین هەیە دەڵێت: لەکاتی هەڵسوکەوت لەگەڵ کەسەکاندا بۆ ئەوەی بیانخەینە خزمەتی سۆسیالیزم، هەڵەیە کە لەسەر بناخەی پرسیار کردن لەلایەنە کەمەکانیان نزیك ببینەوە، بەڵکو ڕاسترە بپرسی ئەم پیاوە دەتوانێت چی تازە بهێنێت، ئەگینا ئاسانە دوای بەسەر چوونی کات بڵێیت: واه... پێویست بوو بەو ڕەنگە کارنەکەم، بەڵکو پێویست بوو بەو شێوازە هەڵسوکەوت بکەم، ئەگینا ئەو پیاوانە! مستەفا سوبحی، شەفیق حوسنی، نازم حیکمەت، حیکمەت قفلجملی و ڕەشاد فوئاد و ئەوانی تربوون کە هزری هاوچەرخیان هێنایە تورکیا، ئەوانە پیاوی باش بوون و مستەفا سوبحی بەهێزترینیانە.

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** ئەوان زیاتر لەوەی بزوتنەوەیەکی سیاسی و کۆمەلایەتی بن پێشڕەوی هزری شۆڕشگێڕین.

**میهری بەللی:** بێگومان، کاتی زۆریان تەرخان کرد بۆ کارکردن لەنێو ریزەکانی کرێکاران و کاریگەریەکی گەورەیان لەبواری هونەر و نوسیندا بەجێهێشت. لەناو ریزەکانیاندا کەسایەتی وەکو نازم حیکمەت و ئەحمەد عارف دەرکەوتن، کە بۆرژوازیەت نەیتوانی کەسایەتی بەو ڕەنگە بخوڵقێنێ.

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** زۆر کاریگەری و باشەیان هەیە لەسەر پێکهێنانی تێگەیشتنی هونەری بۆ کۆمار.

**میهری بەللی:** جیا لەوانە، پارتی کۆمۆنیستی تورکیا ئەندامی ئەنتەرناسیۆنالیزمی یەکەم بوو، خاوەنی ڕێزێکی مەزن بوو، وەك دەزانن ئەو پارتیانەی نەبوونە ئەندامی ئەنتەرناسیۆنالیزم، لە دەرەوەی ریزەکانی بزووتنەوەی مارکسی دەمان.

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** پارتی کۆمۆنیستی تورکیا.

**میهری بەللی:** پارتی کۆمۆنیستی تورکیا لە بیستەکان و سەرەتای سیەکان، جێگەی ئاماژە پێکردنە کە شەفیق حوسنی ئەندامی "ئەو بیست و یەك ئەندامە بوو" کە لیژنەی جێبەجێ کردنی ئەنتەرناسیۆنالیزمی یەکەمیان پێکدەهێنا، لەکاتی ئەندامێتیدا زۆر گفتوگۆ لەنێوان ستالین و شەفیق حوسنیدا پێکهاتبوو، کە زۆر گرنگ بوون، هەندێك شت لەم چوارچێوەیەدا دەوترێت کە دەڵێت: "ئەنتەرناسیۆنالیزم هەڵخەڵەتا، ڕاستی رووی کەمالیزمی نەناسی" بۆئەوەش هاوپەیمانی و پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ کەمالیزمدا درێژە پێدا و، خۆی دوورگرت لە ـ لەبەر ئەم هۆیە ـ هاوکاری سەرهەڵدانە

کوردیەکان، ئەمانە ووتنی درۆیە، راستی بەم شێوەیەیە: بەپێچەوانەی ئەم بانگەشانە یەکێتی سۆڤیەت لەو کاتانەدا دەوروبەری گیرابوو و، لەدابڕانێك دابوو ــ کە چەرچەل خولْقاند بووی ــ لەسەرەوە فنلەندا هەبوو کە دوای کوشتنی 50 هەزار کەس رژێمێکی زۆردار دەسەڵاتی بەڕێوە دەبرد، هەمان شت بۆ پۆلەندا کە بیلسوتسکی دەسەڵاتی بەڕێوە دەبرد دوای کۆمەڵکوژیەکەی منارهایم. کە کۆمۆنیستەکانی بەئامانج گرت، لە کاتێکدا. ئەمیرال هۆرتی کە یەکێك لە پیاوانی نازیزم بوو دەسەڵاتی مەجەرستانی لەدەستدابوو. بەڵام لە بولگاریا و رۆمانیا کە دەسەڵاتێکی ئاسنین لەئارادا بوو، لێرە رژێمێکی فاشی لەسەر دەسەڵات بوو کە تسامکۆف بەڕێوەی دەبرد. یەك زنجیرە بەتەنها لەم گەمارۆیە کەم بوو، ئەویش زنجیرەی تورکیا بوو کە لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا پەیوەندی دۆستانەیان هەبوو. رەوش بەم رەنگە مایەوە هەتا ساڵی 1933و بیرهێنانەوەی دەیەمین ساڵوەگەری دامەزراندنی کۆمار کە زۆر میوانی بەرێز ئامادەبوون وەك "فوراشی و بدینی". جیاواز لەوانە هەندێك وڵات هەبوون کە ئەمڕۆ پێیان دەوترێت جیهانی سێیەم، کە هەموویان یان کۆلۆنی بوون یان نیمچە کۆلۆنی ئیمپریالیزم بوون. یەکێتی سۆڤیەت بۆ پێداویستی پاراستن پێویستی بەم پەیوەندیانە بوو، ئەمەش پرسی یەکەمین بوو بۆئەوەی سۆسیالیزم بتوانێ لەسەر پێی خۆی بمێنێ، بۆئەمەش پێیان داگرت بۆئەوەی کەمالیستەکان لەسەر دەسەڵات بهێڵن، ئەگینا ئەوەی پاڵێوراو بوو کە دەسەڵات بگرێتە دەست کۆمۆنیستەکان نەبوون بەڵکو راستەکان بوون. لەئەنجامی ئەم نزیکبوونانە یەکێتی سۆڤیەت هەڵوێستێکی گرتبوو کە نەیدەخواست زۆری بداتە کەمالیستەکان، ئەمەش هەتا ساڵی 1935 ــ 1936 بەردەوام بوو. بڕیاری نامەرکەزیەت ئەو بڕیارەی کە ئەنتەرناسیۆنالیزم لەسەر کۆمۆنیستە تورکەکان بڕیاری دابوو ناوەڕۆکەکەی بەم شێوەیە بوو:"لەبواری ناوەندێتی خۆیان رێك نەخەن و داوای لێکردن کە بەشێوەیەکی تاك پروپاگەندە بکەن و لەسەر ئاستێکی ناوخۆیی". ئەمەش بەمانای بڵاوبوونەوەی پارتی دەهات، ئەنتەرناسیۆنالیزم بەم بڕیارە دەیخواست بڵێت: ئێمە لەئێوە شتێك ناخوازین جگە لەوەی کە کارەکان نەشێوێنن.

بەڵام ئایا کۆمۆنیستە تورکەکان خۆیان بەم بڕیارەوە گرێدا..؟ ساڵی 1940 هاتمە تورکیا و دوای 15 رۆژ پەیوەندیم کرد بەپارتی کۆمۆنیست بەتایبەت لەو کەسایەتیانەی کە پلەیەك بوون، ئەو کاتە کەس پێی نەووتم:"لای ئێمە نە ناوەندێتی هەیە و نەرێکخستن و نەهیچی تر" بەڵکو ووتیان"ئەوە کارگە و ئەوە لاوان و بچۆ دەست بەکاری رێکخستن بکە".

لەو ساڵە تاریکانەدا کاتێك سوپای هیتلەر گەیشتە نزیکی ستالینگراد و، لە کاتێکدا کە CHP دەرگای خۆی کردبووە بۆ ئەو فاشیستانەی دژی کەمالیزمن، پارتی کۆمۆنیستی نهێنی تاکە ئۆپۆزیسیۆنێك بوو لەتورکیا. تاکە پارتی نهێنی بوو کەچی لەتوانایدا بوو لەبواری راگەیاندن و رێکخستن لەکارگەکان و قوتابخانەکان پێکی دەهێنا بۆ پتەوکردنی کاری رێکخستن. ئەمە راستییەکی جێگیربوو و بەمانایەك لەماناکان پاراستنی رووی تورکیا بوو، کەس ناتوانێت بڵێت: هیچ ئۆپۆزیسیۆنێك نەبوو، بەڵکو کۆمۆنیستەکان تاکە ئۆپۆزیسیۆن بوون، کاتێك سیراج ئوغلۆ بوو بەسەرۆکی وەزیران ووتی: ئێمە لەوانەین کە مەیلی تورکی بە کەمیش بێت بەرێژەی ئەوانی تر پێك دەهێنین، ئەویش وەك دەزانرێت لە پیاوانی ئەڵمانیایە، هەروەها ئێمە تاکە ئۆپۆزیسیۆن بووین لەبەرامبەر CHP کە سەرکەوتنی ئەڵمانەکانی بەکارێکی بەڵگە نەویست دەزانی، من زۆر هەست بەشانازی دەکەم، کە یەکێك بووم لە ئەندامانی، بەڵام بۆ هەڵوێست لەسەر کوردستان..... کوردستان

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەمە خاڵێکی سەرنج راکێشە و گفتوگۆیەکی بەرفروانی لەسەر دەکرێ.

**میهری بەللی:** زۆر بەکورتی باسی دەکەم، سەرهەڵدانی شێخ سەعید تەقیبۆوە، رژێمی کەمالیستی لە شەڕی سەربەخۆیدا کە کوردەکان و تورکەکان بەیەکەوە ئەنجامیاندا سەرکەوتوو بوو. لەو کاتەدا سەرهەڵدانێك لەناوچەی رۆژهەڵات و لەژێر رێبەرایەتی پیاوێکی فیۆداڵ سەری هەڵدا و بەرِوونی ووتی: ئایین لە رەوشێکی ترسناك دایە. رۆشنبیری تورك لە کوردستان زۆر ناسراون، ئەمەش راستیەکە.. کاتێك بڕیارمدا بچمە مەهاباد شەفیق حوسنی پێی ووتم"شوکر بۆ خودا".

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** بۆ جاری یەکەمین...

**میهری بەللی:** ئەمە لەساڵی 1946 روویدا، پشتگیریەکی بەهێزی سۆڤیەتیەکان بۆ کوردەکان نەبوو، PKK لەقۆناخی شۆڕشی جیهانیدا پێگەی خۆی گرت و ناتوانن بەتەواوی لەناوی ببەن، ئەو سەرهەڵدانانە لەچاو تروکانێکدا چۆن لەناو بران..؟ چونکە بەشێك نەبوون لە بزووتنەوەی شۆڕشی جیهانی. هەروەها سروشتی چینایەتی تێدانەبوو. عەلەویەکان دوژمنی سوونیەکان بوون، سوونیەکانیش دوژمنی عەلەویەکان بوون. ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی ئەم سەرهەڵدانانە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** لێرەدا پێویستە خاڵێك زیاد بکەین، ستالین لەو کاتانەدا گومانی لە بزوتنەوە کوردیەکان دەکرد، ووتی:"ئەگەر زۆرتر

پێشبکەوێ ئەبێتە دۆستی ئینگلیزەکان، بەم شێوەیە وای بەباش زانی کە خۆی لێ دوور بگرێت و نەبێتە بزووتنەوەیەکی گرێداوی ئینگلیزەکان.

**میهری بەللی:** بێگومان، بێگومان.. تۆ وای دابنێ کە قەوارەیەك لەسەر بناخەی عەشیرەت و شێخ و شتێکی نزیك ئەو دروست بووبێت، ڕۆژی دوای ئەوە چارەنووسی چی لێدێت..؟ ئەمە روون نییە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەوەش لەسەری زیاد بکە، ئەگەر ئەمە رووبدات ئەوا بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەسەر سنووری سۆڤیەت روو دەدات.

**میهری بەللی:** زۆر نزیك بوو لێیەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** لەسەر سنووری بوو.. هەڵوێستی ستالین رۆڵێکی نێگەتیفی گێڕا لەو گفتوگۆیانەی کە لەسەر ئەم مەسەلەیە کران.

**میهری بەللی:** لەلایەکی ترەوە و وەك دەزانرێت رژێمی کەمالیستی پەیوەندی دۆستانە و گرێدانی لەسەردەمی مستەفا کەمالدا هەبوو راستە کە شەفیق حوسنی هەڵسەنگاندنێکی بۆ سەرهەڵدانی شێخ سەعید کردبوو، پێویستە ئەمە پەسند بکرێت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** بەڵێ ئەوە هەڵەیە، دەبێتە پشتگیریەك بۆ هەڵوێستی کەمالیستەکان هەڵەکەشی لێرەدایە.

**میهری بەللی:** هەرچەندە سەرهەڵدانەکە لەسەدەی 20مدا دەستی پێکرد و لەژێر رێبەرایەتیەکی فیۆدالێدابوو، بەڵام لەبەرئەوەی سەرهەڵدانی گەلێکی بن دەست و لە چوارچێوەیەکی فراواندا بوو، بێگومان لایەنی نیشتمانی هەیە و ئەمەش پێویستە ببینرێت. پێویست بوو ئەو کارە نیشتمانیە ببینێت کە سەرهەڵدانەکە پێکی هێنابوو، هەڵە لێرەدا نەبینینی بوو، جگە لەوانەش ئەو هەڵسەنگاندنە هەیە کە ئەو پارتییەی ناوی "رێگای شۆڕش"ە بۆ سەرهەڵدانی ئاگری کردبووی، لەم هەڵسەنگاندنەدا زاراوەی "ئەوە شەڕێکی گەلێریە" سەرۆکایەتیەکەی چی دەبێ بابێت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** "قفلجملی"یش لەسەر ئەو سەهەڵدانانەی نووسیبوو.

**میهری بەللی:** بیتار جودەت وتارێکی نووسیبوو کە رەزامەندی شەفیق حوسنی لەسەر بوو، کە تیایدا هاتووە:"سەرۆکایەتیەکەی چی دەبێت بابێ لەم شەڕە گەلێریەدا جووتیار ناتوانێ خێزان و گوند و باخچەکەی خۆی بەجێ بهێڵێ و بەدوای مردندا بچێت، بێگومان زۆریەکی لە رادەبەدەر هەیە، ئەم سەرهەڵدانەش لەبەرامبەر ئەو زۆرداریەیە، ئێمە ناتوانین رەخنە لەگەل بگرین چونکە لەدوای بەگەکانەوە بەڕێوە دەچێت. تۆ چوویت هاریکاری بکەیت بۆ دامەزراندنی پارتێکی شۆڕشگێڕ و رێگەی راستی نیشان بدەیت و گەل ئەوە پەسند نەکات..؟ بۆ ئەوە بەرپرسیارێتی لەسەر شانی ئێمەیە.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** گرنگی دانیان بەپرسەکە لە سەرەتای سیەکانەوە دەستی پێکرد.

**میهری بەللی:** وەکو دیارە ئەوان لە ساڵی 1930 وشیاربوونەوە.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** قفلجملی زۆر باشی نووسیوە.

**میهری بەللی:** وتارەکانی قفلجملی لەسەر هەمان رێبازە و خاوەن بەهایەکی زۆرە و، لەگەڵ رێبازی پارتیدا یەك دەگرێتەوە.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** دەڵێت"یەکێتی هێزەکانی رۆژهەڵات"

**میهری بەللی:** بەنووسینی ئەم وتارە قفلجملی بەشداریەکی زۆر بەبەهای پێشکەش کرد، بەلام لەنێوان سالانی 1930 ـ 1960 زۆر گۆڕانکاری پێکهاتن و پرسی کورد بوو بەرۆژەڤی گفتوگۆکان. دەوترێت قفلجملی کۆنفرانسێکی لە کۆلیجی ئەندازەی تەکنیکی لە ئەستەمبوڵ رێکخست و تیایدا ووتی "بۆچی لەسەر مەسەلەی کورد قسە نەکەین". بەردەوام دەبێت و دەڵێت:"ئەوان نایانەوێت خۆیان هیلاك بکەن" ئەمە لەکاتێکدا لەوسالانەدا لەسەر مەسەلەی کورد گفتوگۆ پێش دەخرا، لەساڵی 1967 لە زیندان دابووم، ئەوکاتە وتارێکم نووسی لەژێر ناوی "راستی گەل" ئەم خالانەم تیایدا چارەسەرکرد: نەتەوە چییە، کێن ئەوانەی بەها نەتەوەییەکان پیادە دەکەن، راست یان چەپ، دوایش چوومە سەر مەسەلەی یەکێتی خاك، کێن ئەوانەی کولتوور پێش دەخەن...؟ دوای ئەم شیکردنەوانە دەڵێم؛ ئێمە و کەسانی تر نا، راست نا، زۆر لە گروپە راستەکان هەبوون.... ئەوە من نەبووم کە ئەم مەسەلانەم چارەسەر دەکرد، بەڵکو ئەوە مارکسیزمە کە چارەسەری دەکات، هەموو نەتەوەکان رازی دەکات و لەسەرووی هەمووشیانەوە نەتەوەی کورد.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** ئێوە ووتتان . نا..؟

**میهری بەللی:** بەتەواوی، وەکو ووتم، ئەو وتارەم لە رۆژنامەی ئایدنی سۆسیالیستی (رۆشنبیری سۆسیالیستی) بلاوکردەوە.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** باوەڕ دەکەم ئەوە یەکەمین وتاربوو لە زینداندا نوسراو، خاوەنی بەهایەك بوو، کە لەسەر مەسەلەی نەتەوەیی رادەوەستا.

**میهری بەللی:** بۆ یەکەمین جار لە راگەیاندنی ئاشکرادا وتارێکم بلاوکردەوە کە تیایدا باس لەپرسی کوردان بەشێوەیەکی زۆر راشکاوانە دەکات، لەکاتێکدا کە نوێنەرایەتی بزووتنەوە کوردییەکان ئەم وشانەیان دەرنەدەبڕی.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** لەنمونەی کۆمەڵەی کولتووری رۆژهەلات.

**میهری بەللی:** هەتا ئەوکاتەش دانەمەزرا بوو، ئەو کۆمەڵەیە هەبوو کە پێی دەوترا چل و نۆ.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەو رووداوەم لەبیرە.

**میهری بەللی:** چل و نۆ و ئەوانیتر، لەدوایدا بوونە ئەو، پرسە ئەتنیکیانەی" کە داوای "ئازادی رۆژهەڵات"یان دەکرد، بەڵام بەهیچ شێوەیەك باسیان لە راستی کورد نەدەکرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** واتە ئەوان بەهیچ شێوەیەك وشەی "کوردی"یان بەکار نەدەهێنا.

**میهری بەللی:** بەو شێوەیە بوو، وشەی کوردیان بەکارنەدەهێنا، هەندێك سیمینار ساز دەکراو منیش بەشداری ژمارەیەکیان بووم، باوەڕدەکەم ئەوەی پێشکەشی دەکرد کورد بوو، پرسیاری لە ئامادە بووان دەکرد، جارێکیان پرسی لێکردم: تێڕوانینی ئێوە بۆ مەسەلە ئەتنیکیەکان چییە..؟ بەم شێوەیە وەڵامیم دایەوە: بۆچی ناو لەو مەسەلەیە ناکەیت...؟ بەم شێوەیەش وەڵامم بەردەوام کرد: کوردایەتی... کوردایەتی. بۆ جاری یەکەمین بوو کە گرنگی بدەم بەپرسی کورد. ئەوکاتە وتم:" توانەوەی زۆرەملێ ئیفلاسی کردووە، وەکو سیاسەتی ئەو نەعامەیەکە سەری دەشارێتەوە بەڵام لەشی دیارە، هەموو جیهان بەم مەسەلەیە سەرقاڵە، ئینستیتۆ و سەنتەری لیکۆڵینەوەی کوردی دەکرێتەوە، کوردان برای ئێمەن و بەشێکی گرنگی دانیشتوانی وڵاتەکەمان پێکدەهێنن. بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا گرنگیدان بە مەسەلەی کوردان تاوانە، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە، ئەو کارە بەپەلەی لەسەر شانی ئێمەیە ئەمەیە: بنیادنانی یەکێتی گەلان لەسەر بناخەی ئازادی و یەکسانی (یان هەر گوزارشتێکی تر کە ئەوە بهێنێتە زمان). شۆڕشگێڕێتی بەو شێوەیەیە. نیشتمانپەروەریش بە هەمان شێوەیە. ئەگەر ئەوەمان کرد و، پرسی کوردمان وەکو گەلێك چارەسەر کرد ، ئەوا دەتوانین بڵێین کە ئێمە سنووری پەیمانی نەتەوەییمان خراپ کرد، ئەوەی پێویستە ئەو ئەرکە پێك بهێنێ ئێمەین و حکومەتی دیمیریل نییە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** باش بیرم دێت، چۆن لە شەستەکاندا چارەسەرکردنی پرسی کوردی بەم رەنگە دەستی پێکرد.

**میهری بەللی:** بەم شێوەیە بەردەوام بووم: ئەوەی ئەوەبکات، واتە ئەوەی چارەسەری بۆ پرسی کورد بهێنێ دەسەڵاتی شۆڕشگێڕییە و، حکومەتی دیمیریل نییە. شۆڕشێکی تورکی بەو رەنگە دەتوانێت یەکێتییەکی ئارەزوومەندانە لە کوردستان و لەنێوان هەردوو گەلدا پێکبهێنێت، بەو رەنگەش تورکیا دەبێتە جێگەی هیواو تێڕوانینی هەموو گەلانی جیهانی تینوی ئازادی و، رۆژێك دێت کە هەموو نەتەوەکان وەکو توێژی مێژوویی یەکبگرن، وەك چۆن رووبارەکان یەکدەگرن و ئۆقیانوسەکان پێکدەهێنن،

هەرچەندە ئەمڕۆ دورین بۆ گەیشتن بەو ئۆقیانوسە، پێویستە ئەمە بزانرێت، ئێمە راستی نەتەوە ژیان دەکەین، چاخی نەتەوەکان... بەلام لە سەرەتادا لەنێوان کێدا ئەم یەکێتیە پێکدێت...؟ بێگومان لەنێوان ئەو کولتوورانەی نزیکی یەکترین، لەنێوان تورکیا دوای ئەوەی پرسی کوردی چارەسەر کرد و، کۆمارە تورکیەکان بۆ نمونە، زۆر سروشتییە کە پەیوەندی لەگەڵ ئەو کۆمارە تورکیانەدا ببەسترێت. بۆچی ئەو کۆمارانە روونە کە شۆڕشی تورکیا، هەتا دوێنێ رووی کردبووە شۆڕشی روسیا، سنووری ئەم یەکێتیە درێژ دەبێتەوە هەتا دەگاتە دیواری چین، واتە لە دەریای ئەدریاتیکی هەتا چین.

لەهەمانکاتدا پارتی کۆمۆنیست لەتاراوگە نامیلکەیەکی لەژێر ناوی "نهێنییەکانی شۆڕشی نیشتمانی دیموکراسی" بلاوکردەوە، تیایدا هاتووە کە ئەو چاوی بڕیوەتە ئەو زەویەی لەژێر دەسەلاتی یەکێتی سۆڤیەت دایە و، ئەمەش وەلام بوو بۆ ووتنی سەردەمی نەتەوەکان، ئەو بلاوکراوەیە پێدادەگرێت لەسەر تێکۆشانی چینایەتی و سۆسیالیزم و شۆڕش، زۆر دەنگی دایەوە، جنێت ئەرجا یوراك لە رۆژنامەی میللیەت کە عەبدی ئیبەکچی بەڕێوەی دەبرد، لە دوو ژمارەی بەدوایەکدا لەسەری نووسی.

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** ئەو کۆمەڵەیەش بلاوکراوەی خۆی ئامادە کردبوو.

**میهری بەللی:** چاپیان کرد و لەهەموو شوێنێك بلاویان کردەوە. ئەوکاتە ئامێری فۆتۆکۆپی لەبەر دەستدا نەبوون، نوێ دەکەوتە ناو کار، "تورك ـ ئیش"یش خۆی خستبووە ناو پرسەکەوە و ئەویش هەزاران دانەی لێ بلاوکردەوە، ئێمە لە پێکدادانێکی راستەوخۆدا بووین لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی تورکیا، کە ئەمەش لەلایەن بیرۆکراسیەتی سۆڤیەت و رۆژنامەی میللیەت و سەندیکای "تورك ـ ئیش" دەسەبێنرا.

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** کاریان دەکرد بۆئەوەی لەزیندان دەرنەکەون، بەلام لەپێش ئەوە دا با وەلام بۆ ئەم پرسیارە بدۆزینەوە: رەوشی پارتی کۆمۆنیست و ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەلایەتی لە سالانی 1940 ـ 1950 ، 1950 ـ 1960 چی بوو.

**میهری بەللی:** بزووتنەوەی 1950 ـ 1960

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** 1940 ـ 1950

**میهری بەللی:** ئێوە دەزانن لە 1950 ـ 1960 دەرکەوت.

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** 1940 ـ 1950.

**میهری بەللی:** سەرەتای 1940 باس بکەم، باسی بەشێك لە سالانی شەڕ بکەم.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لە دوایدا و بەتایبەت ساڵانی شەڕی دوای جەنگی جیهانی دووەم.

**میهری بەللی:** دوای جەنگی جیهانی دووەم شەفیق حوسنی هەستا بەدامەزراندنی پارتی کرێکاران و جووتیاران و زەحمەتکێشان کە تەنها توانی شەش مانگ بەردەوام بێت و...! ژمارەیەك لەسەندیکا دامەزرێنران لە شەش سەد بواری کاردا، موستەجاویش پارتیەکی دامەزراند، شەش مانگ دوای دامەزراندنی ئەم پارتیە شەڕێکی سارد دەستی پێکرد و لە کۆتاییەکانی 1946دا لە پرێکا هێرش کرایە سەری. دوای دەرکەوتنم بەمانگێك من لەو کاتەدا وڵاتم بەجێ هێشتبوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بۆچی...؟

**میهری بەللی:** دوای ئەوەی وازم لە چون بۆ مەهاباد هێنا، چومە دەرەوەی وڵات، ئەگەر کات رێگە بدات، دەمەوێت لەسەر ئەو پرسە رابوەستم.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** سەرسووڕهێنەرە...! لەوساڵەدا کۆماری مەهاباد دامەزرا تۆ ئەتویست بچیتە ئەوێ.

**میهری بەللی:** بۆ ئەوەی هەندێك پەیوەندی دروست بکەین.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** یەکەمین هەنگاو بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ کۆمۆنیستەکان و بزووتنەوەی کوردی بونیادبنێین.

**میهری بەللی:** بێگومان مەهاباد لەلایەکی ترەوە، دەرگایەك بوو بۆکرانەوە بەرەو دەرەوە، دەمانتوانی لەوێوە بچین بۆ زۆر شوێنی تر، ئەمەش تایبەتمەندیەکی تربوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** زۆر سەرسووڕهێنەرە کۆمۆنیستێك بەشداری بکات لە ریزەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی.

**میهری بەللی:** بێگومان ئەوان زۆر بەگەرمی پێشوازیان لێدەکردین.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** زۆر سروشتییە.

**میهری بەللی:** وەزیری پاراستن مستەفا بارزانی، بەجل و بەرگی سۆڤیەتی دەگەڕا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** دەتانتوانی لەوێوە بچن بۆ ئازربایجان و روسیا.

**میهری بەللی:** بۆ مۆسکۆ.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ.. هەڵبژاردنێکی راستە.

**میهری بەللی:** بەڵام پێك نەهات.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵام دوایی رووتانکردە بەشداری کردنی شەڕی ناوخۆ لەیۆنانستان.

**میهری بەللی:** دوای چوین بۆ ئەوروپا و داواکردنی بەشداری کردن لە شەڕی ناوخۆی لە یۆنانستان.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** سەرەتای 1947 وانەبوو.

**میهری بەللی:** لەنیسانی 1947 گەیشتمە زەوییەکانی یۆنانستان.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** شەڕ بەردەوام بوو.

**میهری بەللی:** بەڵێ دەستی پێ کردبوو.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** ئەوان دەست پێشخەربوون.

**میهری بەللی:** ئەوکاتە مەسەلەی بەسوپا بوون لامان پێش نەکەوتبوو.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** داوایان لێکردیت لەوێ بمێنیتەوە.

**میهری بەللی:** دوو ساڵ و نیو لە چیاکان ماینەوە، دوای بن کەوتن ناچاربووم لە هاوینی 1949 دەستی لێ بەربدەم، دوای دەرکەوتنی لێبوردنی گشتی لەساڵی 1950 گەڕامەوە بۆ تورکیا. ئەوەی سەرسووڕهێنەرە، کاتێك من لە زیندان بووم، بەهۆی ڕۆڵی من لە بەڕێوەبەرایەتی بزووتنەوەی لاوان، دوو نامەم لە جەلال بایارەوە بۆهات، کە بەکەسایەتی منیاندا هەڵدەدا: "ئێمە خەباتی ئێوە بەرز رادەگرین". پێویست ناکات دووبارە ببێتەوە، نامەیەك بوو، شتی بەو رەنگەی تێدابوو.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** ئەوە لەسالآنی 1940 دابوو..؟

**میهری بەللی:** نا لەساڵی 1946 بوو

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** ئەوە هەوڵدانێکە بۆ بەکارهێنانی چەپ...!

**میهری بەللی:** ئەوکاتە پەیوەندی لەگەڵ مەحەمەد عەلی دا هەبوو، کە پاڵێوراو بوو بۆ ئەندامێتی سەربەخۆ، ئەوکاتە وەڵامم دایەوە و شتێکم ووت.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** دەیخواست چەپ بکاتە هێزێکی یەدەك بۆ خۆی.

**میهری بەللی:** راستە، پێش جەنگی سارد، دەیانویست ئۆپۆزیسیۆنێکی چەپ بونیادبنێن. ئەمە مەسەلەی دەسەڵاتە، دەیانویست ببنە ئۆپۆزیسیۆن لەبەرەی چەپدا.

**عەبدوڵلا ئۆج ئالان:** بەتەواوی هەروەك ئەربەکان ویستی، ئەمە بەڕاستی لەیەك چوونێکی گەورە و سەرسووڕهێنەرە، پێویستە باش شیبکرێتەوە، پارتی رەفا خۆی وەکو چەپ نیشاندا.

**میهری بەللی:** چەپڕەوێتی ئەربەکان....

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** چەپڕەوێتی بایار...

**میهری بەللی:** لە دوایدا لەگەڵ ئیسرائیلدا پەیمانێکی مۆرکرد.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** بەرفراوانترین پەیمانیان بەست.

**میهری بەللی:** ئەگەر ئۆپۆزیسیۆن بوایە، نەیدەتوانی ئەوە بکات، دوای دەرکەوتنم ژنێکم بینی کە دەمناسی پێی ووتم: دۆستمان ــ واتە بایار ــ بەهەرشێوەیەك بێت دەخوازێت چاوی پێتان بکەوێت، من بەرەو ئەنقەرە بەرێکەوتم بەڵام بایار بەرەو ئەستەمبوڵ چوو، بەو رەنگە ئەو چاوپێکەوتنە پێك نەهات و هەرکەس بە رێگەی خۆیدا چوو، دواتر لەسەر ئەو مەسەلەیە لەگەڵ شەفیق حوسنی قسەم کرد، تێگەیشتم کە چووبوونە لای ئەویش، هەڤاڵێکی نزیکی شەفیق حوسنی هەبوو کە لە خەستەخانە کاری دەکرد و سکرتێری پارێزگای ئەستەمبوڵی پارتی دیموکراسی بوو، پێی وتبوو: پێویستە کۆتاییەك دابنرێت بۆ دەسەڵاتی تاکە پارتی و پارتی گەلی کۆماری لەدەسەڵات بخرێت، با لەپێناوی ئەم ئامانجەدا یەکبگرین، شەفیق حوسنی وەڵامی دەداتەوە: من باش تۆ دەناسم، تۆ کەسایەتیەکی دیموکراسی پێشکەوتوخواز و گەرمیت، بەڵام تۆ سەرکێشی هێزێك دەکەیت کە پاڵت پێوەدەنێت ببیتە ئۆپۆزیسیۆنێکی راست لەبەرامبەر پارتی گەلی کۆماریدا. ئەمە لەسەرەتای ساڵی 1946دا بوو.

**عەبدوڵڵا نۆج نالان:** سەرەتای 1946.

**میهری بەللی:** بەڵێ سەرەتای 1946، لەم رەوشەدا، پێویستە ئەو هێزە لەبەرامبەر چیدا بەکار بهێنین...؟ کاتێك لە زیندان بووم زەکی باشبنار سەردانی کردم و پێم وت: هەلۆێستی دکتۆر هەڵەیە، پێویستە یەکێتییەکی بەهێز پێکبهێنن. شەفیق حوسنی هەر لەرۆژی یەکەمەوە دیاری کردبوو کە پارتی دیموکراسی بەرەو کوێ دەچێت، بەمانای پێشکەشکردنی سەردانەواندن بۆ ئیمپریالیزم و ساختەکارەکان وەك بڵێی پێشبڕکێیەکی زۆر گەرمە. ئەگەر لەو سەردەمانەدا بۆ ئۆپۆزیسیۆنێك بگەڕێین، پێویستە ئاماژە بە بزووتنەوەی لاوان بکەین کە خاوەنی گرنگیەکی مەزنە، بەهیجە بۆران و موزەفەر شەریف لەئەندامە چالاکەکانی ئەنقەرە بوون.

**عەبدوڵڵا نۆج نالان:** رووداوەکانی رۆژنامەی (تان) ئاسۆ، هەیە.

**میهری بەللی:** ئەم رووداوانە لەساڵی 1945 لە کاتی زیندانیکردنمدا تەقینەوە، هەروەها رووداوی خوێندکاران و بەرخۆدانی نازیم حکیمەت.

**عەبدوڵڵا نۆج نالان:** ئەمە لە دوایدا درەنگ بوو.

**میهری بەللی:** بەڵێ ئەوە مەسەلەیەکی ترە.

**عەبدوڵڵا نۆج نالان:** عەزیز نەسینیش هەیە.

**میهری بەللی:** عەزیز نەسین دەستی بەدژایەتی کرد لەو وتارە گاڵتەجارانەی کە لە ساڵی 1950 بڵاوی کردنەوە و، زۆر گرنگیان هەبوو.

**عەبدوڵڵا نۆج نالان:** ئۆپۆزیسیۆنێکی گەلێری سنووردار بوو...!

**میهری بەللی:** بەڵێ شتێکی بەو رەنگە، لە راستیدا ژیانی کولتووریش سنووردار بوو، بۆئەمەش جێگەیەکی بەرچاوی هەبوو، گیرانەکانی ساڵی 1951 دەستی پێکرد، لەکاتێکدا شەڕی سارد گەیشتبووە لوتکە.

**عەبدوڵا نۆج نالان:** ئەوە بەرهەمی ئەو شەڕەیە.

**میهری بەللی:** لەلایەك تورکیا هێزی سوپای دەناردە کۆریا، لەلایەکی تریشەوە دەستی بە هەڵمەتی گرتنی بەرفراوان کردبوو، ئێمە ئەمانەمان بەئەنجامی گۆڕانکاری لە دەسەڵات و سەرکەوتنی پارتی دیموکراسی لە بەدەست هێنانی زۆرینەی پەرلەمان بینی، بەو رەنگەش زۆرینە لەسەر دەسەڵات باڵادەست بوو.

**عەبدوڵا نۆج نالان:** بەو شێوەیەتان دی...؟

**میهری بەللی:** ئێمە لەو دە ساڵەی دەسەڵاتی پارتی دیموکراسی لەزیندان و تاراوگە بووین، مەبەستم کادێرە بەرچاوەکانی بزووتنەوەی کۆمۆنیستییە،

**عەبدوڵا نۆج نالان:** بەمانای ئەوەی کە توندوتیژتر بوو لە ساڵانی پێش 1940.

**میهری بەللی:** زۆر دژوار بوو، بێ دەنگی و چەق بەستن بەتەواوی زاڵ بوو، ئەمە راستیەکی نەگۆڕە، بەڕەنگێك من و هەڤاڵەکانم ئەو دە ساڵەی دەسەڵاتی پارتی دیموکراسی یان لە زینداندا بووین یان لە تاراوگە. ئەمەیە مانای رژێمی زۆرینە لەلای ئێمە لە تورکیا. هەروەها رژێمی زۆرینە لە وڵاتی ئێمەدا بەمانای بڵاوبوونەوەی بنکەی ئەمریکی بوو لەهەموو بەشەکانی وڵاتدا، واتە ئەو دەستکەوتانەی لەشەڕی سەربەخۆیی دا بەدەست هێنرا خرایە سەر رەف، خراپ نەبوو ئەگەر ئەو پیاوانە باوەڕیان بە دیموکراسیەتی بۆرژوازی هەبوایە.

**عەبدوڵا نۆج نالان:** لە راستیدا بزووتنەوەی ساڵی 1951، بزووتنەوەیەکی تاریکە لە رووداوەکانی سیەکان و چلەکان دەچێت، بەڵام شەستەکان، دەیەی تاریکە و، دوورە لە روناکی و وشیاری.

**میهری بەللی:** بێگومان سەبارەت بە بزووتنەوەی کولتووری، لەو سەردەمانەدا نازم حیکمەت شیعرەکانی خۆی لە تاراوگە بۆ مردن تەرخان کردبوو، مردنی کۆمەڵگای سۆسیالیستی، دوای ئەوەی لەساڵی 1920 شیعرەکانی نووسیبوو دەیوت:

*ئێمە رۆژ بەڕێوە دەبەین*
*بەڕێوە بردنی رۆژ نزیکە*

لە پەنجاکاندا ئەو شیعرانەی نووسی کە تیایدا داخ و کەسەری تێدایە بۆ وڵات.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** واتە بناخەی بابەتی پەردەپۆش کرا.

**میهری بەللی:** بەتەواوی پەردەپۆش کرا، بیرۆکراسیەت زۆری دابووە یەکێتی سۆڤیەت و هەموو جیهان.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** مەبەستم تورکیایە.

**میهری بەللی:** لە 27ی ئایار کودەتایەك دەرکەوت، دژی ئەو زۆرینە پەرلەمانیە بوو کە دەیخواست دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری دروست بکات، پێویستە ئەمە باش تێبگەین، ئەمە تەنیا دیموکراسیەت و سیستەمی پەرلەمانی خستنە سەر رەف نییە، بەڵکو ئەو پێی دادەگرت لەسەر راکردنی مەندەرێس و رێبازە ئایینیەکان و ئۆپۆزیسیۆن، لەوانەش ئۆپۆزیسیۆنی بۆرژوازی.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەو ـ لەلای خۆیەوە ـ بەرەو شێوازێکی تری دیکتاتۆریەت دەچوو.

**میهری بەللی:** جیاواز... بەڵام بەڕاستی دیکتاتۆری، بانگەشەی دەکرد کە پشتگیری لە زۆرینەی پەرلەماندا هەیە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەوە هاوشێوەی ئەو نمونانەیە بۆ ئەو دیکتاتۆریەتانەی کە ئەمریکا لە کۆلۆنیەکانیدا دروستیان دەکات.

**میهری بەللی:** هاوشێوەی رەوشی ئەربەکان و چیللەرە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئێستاش رەوش بەو رەنگەیە، دیکتاتۆریەتێك کە پشت ئەستوورە بە زۆرینەیەکی پەرلەمانی لەو کاتانەدا زۆر هەبوون کە پشتیان دابووە ئەمریکا لە کۆلۆنیەکانیدا، رێباز، هەمان رێبازە... دیکتاتۆریەتی جیاواز لەژێر ناوی پارتی دیموکراسی پێك دەهێنن. یەك جیاوازی هەیە ئەویش لە رابردوودا پشتی بە میلیتاریزم دەبەست، لەم قۆناخەدا پشت دەبەستێت بە ئەمریکا، هەروەك دەزانن لەو سەردەمانەدا دەزگای شەڕی تایبەت کە گرێدراوی گلادیۆ بوو لەناو سوپای تورکیادا دامەزرا.

**میهری بەللی:** تازە دامەزرێنرابوو، گرێدراوی ئەمریکا بوو، بارەگاکەی لە بینای TUSLOG بوو، مووچە خۆرەکانیان لە ئەمریکا مووچەیان وەردەگرت، بەتایبەت لە CIA.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لەو دەمانەدا سەندیکای ـ تورك ـ ئیش دامەزرێنرا، لە راستیدا ئەوانە هەنگاوی جددی بوون بۆ پاکتاوکردنی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و دامەزراندنی دیکتاتۆریەتێك لەشێوازی کۆلۆنیە نوێیەکان.

**میهری بەللی:** بەڵێ، هەربۆئەوەش کودەتای 27ی ئادار دەرکەوت، بزووتنەوەی 27ی ئادار بزووتنەوەی پارتی گەل بوو، بزووتنەوەی عیسمەت پاشا، لەوانەیە ئێمەش رەوتێکی بەشداربووباین تیایدا، بەڵام لە راستیدا لەلایەن عیسمەت پاشا و پارتی گەلی کۆماری بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەڕێوە

دەبرا، لەکاتێکدا لەناو سوپادا توێژێك سەرکێشی دەکرد کە دەتوانین پێی بڵێین کەمالیستەکان، بێگومان فاشیەکانیش بەو شێوەیە بوون وەکو تورکیش کە بەشداری تێداکرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەمانایەك لەماناکان ئەم بزووتنەوەیە رەنگدانەوەی ئەو ئاستە کۆمەڵایەتیە بوو کە لەو ساتانەدا زاڵ بوو، راست هەبوو، هەروەها ئەوانەی کرابوونەوە بەرەو چەپ.

**میهری بەللی:** نە سۆسیالیزم و نە شتێکی تر بەبیری بکەرانی کودەتای 27ی ئاداردا نەهات، نیازیان چ دەبێت کۆمەڵگای تورکی هەنگاو بەهەنگاو بەرەو چەپ کرایەوە و، راستی و شتە کەڵەکەبووەکانی کۆمەڵگای تورکی لەدەرەوەی ئیرادەی کودەتاچیەکان دەرکەوتە مەیدان، لەدوایدا پارتی کرێکاران دامەزرا و، دۆغان ئۆجی ئۆغلو دەستی کرد بەدەرخستنی رۆژنامەی ئاراستە(یوون). دۆغان وڵاتپارێزبوو جێگەی مەترسی نەبوو و، ئەگەر وڵاتپارێزیەکەی رێکوپێك بکرێت دەتوانیت لەگەڵیدا پەیمان ببەستیت. هەربۆئەوەش پەیمانێکمان لەگەڵیدا بەست، گروپەکەی ئەو کەسایەتی ناسراوی تێدابوو لەوانە: ئیلهان سەلجووق، ئۆغر مەمجۆ، مومتاز سویسال کە ئەمڕۆ ئەندامی پارتی ئەجەویدە، بۆ رێزگرتن لەبیرەوەری دۆغان ئۆجی ئۆغلۆ سلاویان لێ دەکردین، کەواتە کەسایەتی مارکسی ــ لینینی لەم وڵاتەدا پێویست بوو ئەو راستیە بزانێت کە دەبێت وڵاتپارێز و وشیار و دڵسۆز و راستگۆ بێت، ئەمانەش بۆ دۆغان زۆر راستن، هەربۆئەوەش جێگەی قسە و باسێکی زۆرە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەبڕوای من دۆغان ئۆجی ئۆغلۆ راستەقینەترین رۆشنبیری تورکیە.

**میهری بەللی:** بەشداریەکی گرنگی هەیە لە تێکۆشانی دیموکراسیدا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەو گرنگترین رۆشنبیرە لەگەشەپێدانی بزووتنەوەی رۆشنبیری لە دوای ساڵانی 1960.

**میهری بەللی:** هەندێك پڕوپاگەندەی خراپ لەسەر ئەو بڵاوبوونەوە کە دەڵێت "میهری بەللی دۆغان ئاراستە دەکات و بەڕێوەی دەبات، هەروەها پڕوپاگەندەیان بۆ منیش بڵاوکردەوە ووتیان "میهری بەللی گرێدراوی دۆغان ئۆجی ئۆغلۆیە" و پڕوپاگەندەی بێ بناخەی تریش، چونم بەو رەنگە بوو، بەڵام ئەو بەشداری رەوشی بەرجەستەبوو، دۆغان لە بناخەیەکی جیاواز ترەوە دێت، بەڵام لەمەسەلەی دیموکراسیەت و سەربەخۆیدا یەکمان گرت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** کەواتە تۆ و دۆغان و پارتی کرێکارانی تورکیا کرانەوەتان بەرەو چەپ ئاراستە کرد...

**میهری بەللی:** من و دۆغان بەیەکەوە لەڕۆژنامەی ئاراستە دەمان نووسی.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** پارتی کرێکاران پێشکەوتن بەدەست دەهێنێت، بۆئەوەی لەدوای ئەو شۆڕشی نیشتمانی دیموکراسی پێش بکەوێت.

**میهری بەللی:** لێرەدا شتێك هەیە پێویستە بەبیری بهێنمەوە، دوای تەواوبوونی سەردەمی رۆژنامەی ئاراستە، دەستمان کرد بە بڵاوکردنەوەی نووسینەکانمان بەدەستی خۆمان، دۆغان وردە وردە لێمان دورکەوتەوە، بۆئەوەی لەدوایدا چەپڕەوایەتی میلیتاریستی ئەو پێش بکەوێت.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** دوای ئەوە چەپڕەوایەتی میلیتاریستی ئەو دەستی پێکرد.

**میهری بەللی:** لەژێر سەرپەرشتی سەرۆك وەزیران دەست پێدەکات.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** ئەوە ساڵی 1965 بوو...؟

**میهری بەللی:** نەخێر لەساڵانی 1967 ـ 1968 بەدواوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** دوای رۆژنامەی ئاراستە دوریان دەرکەوت، ئێوە رێگەیەکی جیاوازتان هەڵبژارد.

**میهری بەللی:** ئێمە دەستمان کرد بە گفتوگۆ کردن لەگەڵ بنکەکانمان لە رێگەی بڵاوکراوەکانمان.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** دۆغانیش پشتی بەست بەسوپا و بەبناخەی گرت.

**میهری بەللی:** ئێمە لاوانمان بۆ خۆمان بەبناخەگرت.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** ئێوە لاوانی شۆڕشگێڕتان بۆخۆتان بەبناخەگرت.

**میهری بەللی:** دوای کودەتای 12ی ئەیلول من لەماڵی سری لە بیوك کادە خۆم حەشاردابوو،

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** بەڵکو 12ی ئادار.

**میهری بەللی:** بەڵێ پشتی 12ی ئادار، بۆئەوەی تەندروستی خۆم بپارێزم هەموو بەیانیەك لەناو دارە سنۆبەرەکاندا راکردنم ئەنجام دەدا، رۆژێکیان کاتێك رام دەکرد لە دوورەوە دۆغان ئۆجی ئۆغلۆ و ژنەکەیم بینی، لەسەرەتادا منی نەناسیەوە چونکە ریشم درێژبوو شێوەم گۆڕابوو، پێی ووتم: ئەگەر بەپۆلیس بڵێم بە رێکەوت یەکتریمان بینیوە باوەڕمان پێ ناکەن و، دەیانووت: ئێوە لەسەر ئەو چیایە پەیمانتان هەبوو یەکتری ببینن.

**عەبدوڵڵا نۆچ نالان:** هەروەها دەیووت: ئێوە یەکتریتان بینیوە بۆ کاری رێکخستن.

**میهری بەللی:** بەدرێژی قسەمان کرد، پرسیاری لێکردم بۆچی سەری لێ نادەم. دوایش ووتی وەکو دەزانیت من کازاخیم و، بانگی کردم کە سەردانی بکەم، لەوکاتەدا پرسم لێکرد چی دەکات، وەڵامی دایەوە "دەستیان لێ نەدام،

دوای ئەوەی زانیان پیاوێکی جددیم و بەنووسینی مێژوو خەریکم هیچیان لێ نەکردم". بەپێکەنینەوە وەڵامم دایەوە "وەکو دیار دەبێت ئێمە جددی نین" گرنگ لەکاتی جیابوونەوەدا پێم ووت: دۆغان بڕوانە کاتێك بەیەکەوە کارمان دەکرد بەبەردەوامی پێشدەکەوتین و ئەوانی تر بەرەو دواوە دەچوون، لەدواییدا کەوتیتە هەوەسی میلیتاریزمی چەپڕەوایەتی و، بوویتە دیلی ئەو هێزەی کە هەرچەندە خاوەن شانە پانەکان بێنە ناومان، زۆرتر و بەخێرایەکی مەزنتر دەتوانین بگەینە دەسەڵات، لەدواییدا جیابووینەوە، لەو رۆژەوە ئەوانەش بەرەو پێش هاتن و ئێمەش بەرەو دواوە چووین. هەتا دوایی گوێی لێ گرتم، بێ ئەوەی هیچ بڵێت، ئەمە چاوپێکەوتنی دوایمان بوو، سەرەتای حەفتاکان سەردەمی زێرینی بزووتنەوەی 27ی ئایار بوو کە پارتی گەل و لاوانی پارتی گەل رێبەرایەتیان کرد، هەروەها پارتی جەماوەریش بەشداربوو، بەڵام لەدواییدا هیوای لاوان بەهەڵوێستی پارتی گەلی کۆماری شکا و، ئەمجارەیان لەدەوروبەری پارتی کرێکاران کۆبوونەوە و روویان کردە ئامانجە سۆسیالیستیەکان.

**عەبدوڵڵا نۆچ تالان:** لە دوای ئەوە بزووتنەوەی قوتابیان و لاوان دەستی پێکرد.

**میهری بەللی:** پشتمان بە لاوانی زانکۆ بەست، چونکە توێژەکانی تر هەر لە بەرەبەیانیەوە بۆ تێرکردنی زگی خۆیان کاریان دەکرد، لەدوای ئەوەش ئەو جیابوونەوە رادیکاڵیەی لاوان دەرکەوت لە پارتی کرێکاران و، بووە بزووتنەوەیەك کە هەموو کەسە باشەکانی بۆ ماوەی 50 ساڵ لە تەمەنی بزووتنەوەی مارکسی ـ لینینی کۆکردەوە. لەدوای ئەوەش دەست پێشخەری کەوتە دەستمان، لەو ساڵانەدا ئێمە پێشدەکەوتین و بەرامبەرەکەشمان بەرەو دواوە دەچوو تا ئەو کاتە هات کە تێگەیشتن رەوشیان باش نییە، لەوکاتەدا هێزە دەسەڵاتدارەکان یاساکانیان پێشێلکرد و دەستیان بەکوشتنی یەك لەدوای یەکی پیاوان کرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ تالان:** بزووتنەوەی فاشی دەستی بەئەنجامدانی تاوان کرد.

**میهری بەللی:** نەخێر، دەوڵەت ئەم کارەی کرد، بەمانایەك بزووتنەوەی فاشی ئەو کارەی نەکرد، بەڵکو دەزگای موخابەراتی تورکی (MIT) بوو، لەوانەیە بزووتنەوەی فاشی بۆ ئەو کارە بەکاری هێنابێ. بزووتنەوەی فاشی زانکۆکانی کردبووە سەرەتای دەرکەوتنی، لەکاتێکدا لە چەند سەربازگەیەکی تایبەت پەروەردەیان دەبینی و پارەی گەلیان دەخوارد، کاتێ گەڕانەوە قوتابیەکان لێیان دان، دوایش یەك لەدوای یەك دەستیان کرد بەکوشتنی خەڵك.

یادەوەریـەکم لەگـەڵ دەنیـز گەزمیشـدا هەیـە، دەمـەوێ باسـی لێوەبکـەم: کاتێك من لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست بووم (زانکۆی رۆژهەلاتی ناوەڕاست) دەنیز دەیخواست سەردانم بکات، نەمزانی بۆچی نەهات، هاوڕێیـەکی خـۆی نـاردە لام کە ناوی عیسمەت بوو، پێی ووتم چاوپێکەوتن لە دارسـتانی زانکۆدا پێکـدێت، کاتێـك بینـیم پرسـیارم لێیکـرد: بۆچـی نـەهاتی، وەلامـی دامـەوە و ووتـی "دەیانەوێت بمکوژن" وەلامم دایەوە و ووتم: نا ئێستا ناتکوژن، چونکە ئەگـەر وابکەن ئالۆزیەکی گەورە دەردەکەوێ، بەلام بێگومان نۆرەت دێـت. بـەڵێ ئـەوە رەوشی سـەرۆکایەتی لاوان بـوو، هـەر بۆئـەوەش رێگـەی خـەباتی چـەکداریمان هەڵبـژاد، وامـان دەزانـی ئـەوە راسـتە، داوامـان کـرد کـە هێـزی گـەریلا و شۆڕشگێڕان پێکبهێنرێ، بەلام هـیچ کام لەمانـە روویـان نـەدا، بـەڵکو هانامـان برد بۆ پاراستنی خۆمان.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** پاراستنی رەوا.

**میهری بەللی:** بەتەواوی پاراستنی رەوا، وای دەبینم کە ناولێکردنی شەڕی گـەلێری، یـان شـەڕی پێشـڕەوایەتی بـۆ ئـەم کـارە، دیـاریکردنێکی ناڕاسـت و زێدەڕۆییە..

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** دەخوازیت بڵێیـت: هـیچ ئامادەکاریـەك و رێکخسـتنێك بۆ دەست پێکردنی شۆڕشی چەکداری نەبوو.

**میهری بەللی:** نەخێر، ئەوانە نەبوون، واتە ئێمە هاتینە بەردەم رەوشێکی داسەپاو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لەسەر ئەم بناخەیە خۆتان چەکدار کرد.

**میهری بەللی:** بەڵێ.. هەڵەکەمان بەم شێوەیە بـوو، لـەجیاتی بیرکردنـەوە لـەگرتنی هەڵوێسـتی پاراسـتنی ناوەنـدی، ئێمـە پاراسـتنێکی فـەردی مـان کـرد، دەمـان ووت: هـەر کەسـێك پێویسـتە خـۆی بپارێزێـت. هـەر کۆلیجێـك خـۆی بپارێزێت، ئەگـەر هـەر کـەس و کۆلیجێـك ئـەوکارە بکات، پێویسـتیان بەئێمـە چییە..؟

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بڵاوبوونەوە دەستی پێکرد...

**میهری بەللی:** بەم هەڵوێستە بناخەی بڵاوبوونەوەمان داڕشت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** هەڵـەتان لێرەدایـە، پێویسـت بـوو لیژنەیـەکی کۆردیناسیۆنی ناوەندی پێکبهێنن.

**میهری بەللی:** کۆردیناسـیۆن بـاش بـوو، ئێمـە پارتیـەکی ناوەنـدی نهێنی نەبووین، بەڵکو رێکخستنێکی پاراستن بووین.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** کۆمیتەی پاراستن..

**میهری بەللی:** بەڵێ... گرێدراو بوو بە دەسەڵاتێکی ناوەندی، بەڵام ئێمە ئەو کارەمان بە تەنیا هێشتەوە، لەکاتێکدا هەندێك کەس کەوتبوونە ناو کارەکە کە هیچ توانایەکیان نەبوو.

**عەبدوڵڵا نۆج ناڵان:** لەبەرئەوەی هەڵنەستان بە پێکهێنانی ناوەندێتی کاری سیاسی و پراکتیکی، ئەمە رێگەی کردەوە بۆ دەرکەوتنی ئەو گروپە چەکدارانەی کە لە دەرەوەی کۆنترۆڵ بوون و ئاڵۆزیەکی گەورەیان دروست کرد و، رێگەیان کردەوە بۆ دەست تێوەردانی دەسەڵات لەکارەکاندا.

**میهری بەللی:** هەڵەیەکی گەورە بوو، لەدەرەوەی ئەوانەش ئەو توانا گەورەیەی شۆڕشی فەلەستین خوڵقاندبووی بەباشی سەرنجمان نەدا و سوودمان لێ نەبینی.

**عەبدوڵڵا نۆج ناڵان:** لە راستیدا ئێوە دەتانویست بچن بۆ مەهاباد، بەڵام خۆتان لەناو ریزەکانی سەرهەڵدانی یۆنانیدا بینیەوە، بەڵام سەرهەڵدانێکی فەلەستینی جددیتر هەیە، ئەگەر ئێوە راست هەڵسەنگاندنتان بۆی بکردایە و، بتانکردایەتە گۆڕەپانی ئامادەکاری و جێبەجێ کردنێکی راست.

**میهری بەللی:** خۆزگە وامان بکردایە، ئەمەوێت لێرەدا ئاماژە بەشتێك بکەم، لەو ساڵانەدا هەرکەس چووبایە لای فەلەستینیەکان و داوای چەکی بکردایە، ئەوان داوای هێنانی کتێبێکی میهری بەللی یان لێدەکرد.

**عەبدوڵڵا نۆج ناڵان:** توانا هەبوو گەریلایەکی تورکی پێکبهێنن.

**میهری بەللی:** ئەندامەکانی ئامادەبوون، بەڵام بڵاوبوونەوە، دواتر چوومە گۆڕەپانی فەلەستین بەڵام درەنگ بوو "ساڵێکی تەواو" ئەمەش مانایەکی گەورەی هەبوو.

**عەبدوڵڵا نۆج ناڵان:** دوای 12ی ئادار...

**میهری بەللی:** دوای 12ی ئادار....

**عەبدوڵڵا نۆج ناڵان:** پێویست بوو لە پێش ئەوەدا بچیت، بۆ نمونە لەساڵی 1970دا.

**میهری بەللی:** بەڵێ... پێویست بوو پێش ساڵێك چووبام.

**عەبدوڵڵا نۆج ناڵان:** بەڵێ، ئەگەر ئەو ئامادەکاریەتان لە فەلەستین کردبایە، بێگومان بزووتنەوەی لاوان بەتەواوی بەرەو گەریلا دەچوو، وەك چۆن لە وڵاتانی ئەمریکای لاتینی دەرکەوت، ئاواش تورکیا دەبووە خاوەنی گەریلا. بەداخەوە هەوڵدانی سینان، درەنگ بوو.

**میهری بەللی:** درەنگ و هەرزەکارانە بوو، لەگەڵ ئەوانەشدا ئەو بڕیارە هەبوو کە نیبایەی گشتی کۆماری لە ساڵی 1960 ــ 1969 لەسەری

پێکهاتبوون: پاراستنی شۆڕشی نیشتمانی دیموکراتی تاوان نییە. پێویست بوو دەست پێشخەری بکەم و یەکسەر پارتیەکی ئاشکرا دابمەزرێنم.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** دامەزراندنی پارتیەکی ئاشکرا.

**میهری بەللی:** پێویست بوو من بۆخۆم دایبمەزرێنم.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** دانەمەزراندنی هەڵەیەکی زۆر گەورەیە.

**میهری بەللی:** پێویست بوو ئەو پارتیە دابمەزرێنم، نەك وەکو پارتیەکانی تر، بەڵکو پارتیەك بتوانێت بەسەدان هەزار کەس لە گۆڕەپانی ئەستەمبوڵ، ئەنقەرە، ئیزمیر، ئەدەنە کۆبکاتەوە و داوای دامەزراندنی پارتی بکات.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** واتە پێویست بوو پارتیەکی ئاشکرا بۆ ئەو بنکە جەماوەریە فراوانە دابمەزرێنن.

**میهری بەللی:** پێویست بوو دایبمەزرێنین، لەبەرامبەردا بەڵکو رژێم قەدەخەی بکردایە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** گرنگ نییە.

**میهری بەللی:** هیچ پرس نییە، ئەوکاتە ئێمە ئەو کارەمان کردووە کە دەبوو بیکەین.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئێوە دەبوونە خاوەنی رەوایی بوون، رەوایی بەرخۆدانی پێویست، لەسەر ئەوە یەکەم؛ دانەمەزراندنی پارتیەکی ئاشکرا لەساڵانی 1969 ـ 1970 دووەم؛ پەیوەندی نەبەستن لەگەڵ شۆڕشی فەلەستینی کە لەو ساڵانەدا زۆر زیندوو و چالاك بوو و، ئامادەنەکردن بۆ گەریلا، ئەمانە گرنگترین هۆکارن بۆ شکستی ساڵی 1971، لەگەڵ ئەوانەدا جووڵەی خۆرسك و بێ ئامادەکاری گروپە لاوەکان و هەڵسانیان بە ئەنجامدانی هەندێك چالاکی بێ کۆردینە کە دەرفەتی سەرکەوتنی تێدانەبوو.

**میهری بەللی:** بەتەواوی بەپێچەوانەوەیە، خزمەتی لایەنەکەی تری دەکرد و گەلی لێ دوور دەخستینەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لێرەدا دیاریکردنێکی بچووکم هەیە لەسەر ئەم مەسەلەیە، گەلی تورك....

**میهری بەللی:** رێم بدە کە ناڕەزایی لەسەر ئەوە نیشان بدەم، نەدەکرا لەو شەڕەدا سەربکەوین، بەڵام دەمانتوانی بناخەی بەهێز بۆ بەرخۆدانی دابنێین.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بناخەی بەهێز و میراتێکی بەهێز بۆ ساڵانی دوای 1970، تۆ راست دەڵێی، بەڵام راوەستانتان لەبەرامبەر کودەتای فاشی میلیتاری کە لەساڵی 1971 دەرکەوت هیچ راست نەبوو، شیمانەی بنکەوتنیش هەبوو.

**میهری بەللی:** بەڵام توانای بەرخۆدانێکی دلێرانە هەبوو.

**عەبدوللّا نۆچ ئالان:** کودەتای 12ی ئادار نەیدەتوانی بەئاسانی ئەنجام بەدەست بهێنێت، ئەو هەموو توانا شۆڕشگێڕیە گەورەیە لە ماوەیەکی کەمدا لەناو نەدەچوو، لە راستیدا دەرفەتەکەتان لەدەستدا، هەر بۆئەوەش سوودێکی گەورە و پێویست هەیە کە رەخنەیەکی تایبەتی بەو رەنگە بدەن: من خۆڕاگرتن و بەرخۆدانی رابردووتان بەرز و پیرۆز رادەگرم، کاری بنچینەیی ئەو کۆمۆنیستانەی باستان کرد ئەوەبوو کە: ببنە تێکۆشەری هزری شۆڕشگێڕی و هێزی پێشرەوایەتی، ئەمەش کارێکی پۆزەتیفە و ناکرێت نکۆڵی لێبکرێت و بەگەیشتنە سالانی 1967 سەرکەوتنی پێویستی بەدەست هێنا، دارمانی ئەو هاوپەیمانێتیە شتێکی باش نەبوو، خۆ تەنیاکردن لە بەرامبەر هێزی مەزنی سەربازی کارێکی نێگەتیفانە بوو، کە وایکرد دۆغان ئۆجی ئۆغلو سەرنەکەوێت، ئەگەر یەکگرتن بەردەوام بووایە بواری سەرکەوتن زۆرتر دەبوو. هەستانی ئێوە بەگەشەپێدانی بزووتنەوەی لاوانی شۆڕشگێڕی تێکۆشەر لەبەرامبەر پارتی کرێکاران هەنگاوێکی پۆزەتیفە، منیش ئەو قۆناخەم بینی، پێیان دەووترا، شۆڕشگێڕە نیشتمانیە دیموکراسیەکان. ئەم هەنگاوە بێگومان پالێکی دیکەی بەلاوانەوە نا بەرەو پێش، بەلام لە ئەنجامی سروشتی ئەم پێشکەوتنە پێویست بوو پارتیەکی ئاشکرایان هەبێت...! لەوانەیە بەردەوام بێت یان نا، لەوانەیە دابخرێت یان نا، ئەمە گرنگ نییە. گرنگ لێرەدا دانەمەزراندنی ئەو پارتییە هەڵەیەکی مەزنە. بەلام هەڵەی گەورەتر ئەوە بوو کە گوێیان لەدەنگی پێی کودەتای 12ی ئادار بوو واتە دەنگی پێی فاشیزم کە زۆری دەکرد پێداویستی پێکبێت، لە راستیدا ناکرێت بڵێین: لاوانی شۆڕشگێڕ ئەوەیان دەرك پێنەکرد، بەتایبەت ئەوان ئەزموونی ڤێتنام و کوبایان دەخوێند و گفتوگۆی تیۆری شەڕی گەلیریان دەکرد، بەلام ئامادەکاریە پراکتیکیەکان تەواو نەبوون...! وەکو باسمان کرد فەلەستین لەبیری کەس دانەبوو و، ئەگەر بەبیریاندا هاتبێ، کەس بەجددی لەسەری رانەوەستا.

**میهری بەللی:** لە راستیدا هەندێك وەهم لامان هەبوو، ئێمە دەمان ووت: عەرەفات بەو شێوەیە سلاو دەکات.

**عەبدوللّا نۆچ ئالان:** ئەم وەهمانە شایەنی گفتوگۆ نییە، خۆزگە ژیرێك هەبوایە و گروپێکی لە چل ـ پەنجا کەسی پێك بهێنایە، هاتن زۆر ئاسان بوو، هیچ کێشەیەك نەبوو، وەکو ئەمڕۆ دەردەکەوێت، ئەو کاتە گروپێکی گەریلای بەتەواوی بەرپرسیار دەردەکەوت، وەك چۆن هۆشی منە لەو کاتانەدا پێکی هێنا، لە شەستەکاندا گروپی گەورە دەهاتن لەجەزائیر پەروەردەیان دەبینی و دەگەڕانەوە بۆ مۆزەمبیق و ئەنگۆلا و ولاتانی تری ئەفریقیا و لەدواییدا

شۆڕشیان دەست پێدەکرد، ئەگەر ئێوەش کارێکی بەم شێوەیەتان بکردایە، ئەوا لە چیای تۆرۆس دەستتان پێدەکرد و هەتا دەگەیشتنە ناوچەی دەریای رەش لەتورکیا. سوپایەکی سەرنج راکێشی گەریلا دروست دەبوو، بێگومان ئەنجامدانی ئامانجێکی بەو رەنگە زۆر ئاسان نییە، بەڵام بەسەدان هەزار لاو و جووتیار و کرێکار لە رەوشی ئامادەییدا بوون، لە چوارچێوەی پەیوەندیەکی پتەو لەگەڵ ئەو توێژ و چینانە زۆر ئاسان بوو، پارتیەکی ئاشکرا دابمەزرێت ـ دەرفەتیش بۆ ئەوکارە ئامادە بوو ـ هەروەها پێشخستنی بزووتنەوەی جووتیاران لەگوند، بەتایبەت لەناوچەی دەریای رەش و تۆرۆس و ئەنتاکیا. وەك دەزانن لەوێ زەمینەی بەهێزبوو، بڵاوکردنەوەی گروپی گەریلا لەو ناوچانەدا، وەکو گەریلای سوپای رزگاری گەلی تورکیا و سوپای رزگاری کرێکاران و جووتیارانی تورکیا نەبوو کە درەنگ دەرکەوت، بەڵکو بەشێوەیەکی نەخشە بۆکێشراو بوو پاش ئامادەکاریەکی پێویست و کۆبوونەوەیەکی راست، کە ئەمە دەیتوانی رێگا لەبەردەم بەرخۆدانیەکی کاریگەر لە بەرامبەر کودەتای 12ی ئادار بکاتەوە و، کاریگەریەکی زۆری لەسەر قۆناخی ئایندە لە ساڵی 1970دا هێشتەوە. بەڕای من هەلەکەتان لەدەستدا دوایش سوپای رزگاری گەلی تورکیا و سوپای رزگاری کرێکاران و جووتیارانی تورکیا و پارتی رزگاری گەلی تورکیا بەساڵان درەنگ هاتن بۆ ئەو کارەی کە پێویست بوو ئێوە ئەنجامی بدەن، ئەم دواکەوتنەش هۆکارە بۆ سەرنەکەوتن، بەداخێکی گەورەوە ئەم رێکخستنانە تەنیا رێکخستنی خۆرزگار کردنە، ئەم رێکخستنانە درەنگ هاتوون، بەژێر کەوتن کۆتاییان دێت و زەمینەی قووڵکردنەوەی بڵاوبوونەوە و کەمکردنەوەی توانای سەرکەوتنی خەباتی چەکداری دەرەخسێنێ، ئەگەر دەتانەوێ با ئەمە چارەسەر بکەین...

**میهری بەللی:** رێگەم بدە ئاماژە بەخاڵێکی گرنگ بکەم لەو قۆناخەدا، لەساڵی 1962 هەواڵێکم لە یەکێتی سۆڤیەتەوە بۆهات کە داوای دەکرد بیرۆیەك لەدەرەوە بکرێتەوە، خراپ بوونی پەیوەندیەکان لەگەڵ چیندا زێدەتر بوو، بەڵام شاراوە بوو و ئاشکرا نەبوبوو، پیلانی دەکرد بیرۆیەك لەدەرەوە بکاتەوە کە زەکی باشتمار بەرپۆەی ببات، ئەمەش لە یەکێتی سۆڤیەت جێگیرببوو، رێنمایەکانی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بەو شێوەیە بوو، وەڵامم دانەوە: ئەگەر پێویست بێت بیرۆیەك لەدەرەوە بکرێتەوە، ئەوا ئێمە بڕیاری ئەوە دەدەین، هەروەها ئەوەی بەڕێوەی ببات لەلایەن ئێمەوە دیاری دەکرێت، بەتایبەت کە زەکی لەقۆناخی لێکۆڵینەوە و زیندان، لەکۆمیتەی ناوەندی خرابوو، دوای ئەوانە لەگەڵ هەڤاڵاندا لەسەر ئەو مەسەلەیە قسەم کرد و هەڵوێستی منیان راست بینی و پێیان باش بوو.

**عەبدوڵڵ نۆچ ئالان:** من باش لە هەڵوێستی ئێوە تێدەگەم، ئێوە دەتانویست ڕێبازێکی ئایدیۆلۆژی سەربەخۆ پیادەبکەن.

**میهری بەللی:** من زیادەم کرد و ووتم: ئێمە لەگەڵ یەکێتی داین لەناو ریزەکانی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و، دوورین لەهەموو توندڕەویەك کە زیان بەو یەکێتیە بگەیەنێت.

**عەبدوڵڵ نۆچ ئالان:** ئێوە ئاماژە بەهەڵوێستی هۆشی منە دەدەن.

**میهری بەللی:** بەڵێ وەڵامی ئێمە بەو رەنگە بوو، دوای ئەوە ئێستگەکەمان دەستی پێکرد، "ئێستگەی پارتی کۆمۆنیستی تورکی" بەناردنی جنێو و شتی ناخۆش بۆمان، بەڵام چۆن...؟ جار جار تاوانباریان دەکردین کە تروتسکین جارێکی تر ستالینیستین و سێیەمیش ماوین، ئەمە باوەڕی پێ ناکرێت..! مرۆڤ چۆن دەتوانێت لەیەك کاتدا هەرسێکیان بێت..؟ هەندێك هەبوون ئێمەیان رەخنەکرد: ئێوە بۆچی بەگوێرەی پرەنسیپی پارتییە کۆمۆنیستە کلاسیکەکان ریکخستنتان دروست نەکرد، ئێمە نەمان کرد چونکە کردنی هەڵەبوو.

**عەبدوڵڵ نۆچ ئالان:** ئەوانەی رەخنەیان دەکرد لە ئەندامە کۆنەکانی پارتی کرێکاران نەبوون...؟

**میهری بەللی:** بەڵێ... ئەمرۆ هەڵدەستن بە کۆکردنەوەی کادیرە کۆنەکان و تێکەڵ کردنی بە لاوان و منداڵان... هیچ کادیرێکیان نییە بایەخی هەبێت.

**عەبدوڵڵ نۆچ ئالان:** لەڕاستیدا هەڵبژاردنەکەتان ئامانجی خۆی پێکاوە.

**میهری بەللی:** لەلایەکی ترەوە ئەو لاوانە هەن کە زۆر بە جۆش و خرۆشن، بەڵام کەوتوونەتە ناو تۆڕی ئاشکرایی، بۆ پێکهێنانی رێکخستنێکی شاراوە لە چەندرۆژێکی یەکەمدا ئاشکرا دەبن و کارەکە دەبێتە پیلانگێری. لەدەرەوەی ئەمانەش من رەوشی دەنیز و هەڤالانیم دەبینی: 10ـ 15 کەس ئەچوونە شەقام و رێپێوانێکیان رێك دەخست و بەهەزاران بەشداریان تێدا دەکرد و دوای پۆلیس دەکەوتن، دوایی بەدەیان لەوانە دەگیران، بێ ئەوەی یەکێکیان بتوانێت رابکات، بارودۆخەکە بەم رەنگە بوو، لەلایەکی ترەوە پشتگیری گەلێری بێ سنوور بوو، لەوەش زیاتر بەڤاڵەکان لاوەکانیان دەگرت و تەسلیمی پۆلیسیان دەکرد، خۆت بخەرە جێگەی ئێمە، پێم بڵێ چۆن هەڵسوکەوتت دەکرد، لەبارودۆخێکدا کە ئەو شێوازە باوانەی پارتییە کۆمۆنیستە کلاسیکیەکان و ئەوانی تر زاڵ بوو، پاڵیان پێوە دەنای بۆئەوە، لەژێر ناوی لینین لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم بەو رەنگەی نووسیوە. لینین بەو شێوەیە نووسی چونکە ئەو شێوازەی لەو کاتەدا بە خوڵقکاری دەبینی، تۆش خوڵقکار ببە و، لەشێوازی وا بگەڕێ کە بگونجێت لەگەڵ رەوشەکە..!

**عەبدوڵڵ نۆچ نالان:** لەڕاستیدا شێوازی بەڕێوەبردنی ئێوە لەو کاتانەدا هەڵە نەبوو، ئەگەر ئەو دوو خاڵەتان تەواو بکردایە کە ئاماژەم پێکرد، سەرکەوتنێکی گەورەتان بەدەست دەهێنا، ئەگەر پێویستە ئەو قۆناخە رەخنە بکرێت، ئەوا پێویستە لەم خاڵەدا رەخنە بکرێت.

**میهری بەللی:** لەوانەیە سەرکەوتن پێك نەهاتبێ، بەلاّم بێگومان قازانج کردن هەبوو.

**عەبدوڵڵ نۆچ نالان:** تەواو راستە، سەرکەوتن پێك نەدەهات، بەلاّم دەکرا کە ئالاّی بزووتنەوەیەکی کۆمەلاّیەتی و گەریلایەکی زۆر پێشکەوتوو هەڵبکرایە، هەڵوێستی ئێوە لەو قۆناخەدا هەڵوێستێکی شۆڕشگێڕی بەهادارە، وەك هەڵوێستی هۆشی منە. یەکەمین وتارتان لەسەر مەسەلەی کورد لەساڵی 1967 نووسیبووتان، خاوەنی بەهایەکی بڵندە و بۆشاییەکی کردەوە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لەنێوان بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و نیشتمانی، پرسەکە کەوتە ناو ریزی کارەکان، لەگەڵ کەوتنە ناو ساڵانی حەفتاکان و باس لە پەیوەندی لەگەڵ کوردان دەکرا، لەناو ریزەکانی لاوانی شۆڕشگێڕ تێکۆشەری هەڵکەوتوو هەبوون وەك عومەر عەینە و عەونی کۆك ئۆغڵو، لەدوایدا هەموویان شەهید بوون، من ئەوانەم باش دەناسی، ئەوانە زۆر بەجۆش بوون بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد و چارەسەرییەکی شۆڕشگێڕانە، ئەمەش زۆر کاریگەری لێ کردم، گرنگ ئەوەبوو کە من کردم و دەخوازم بەکورتی بڵێم، لەوساڵەدا بەشێوەیەکی دیار چوومە ئەستەمبوڵ، کەمێك پێش 12ی ئادار، من لەوێ بووم کاتێك کودەتای 12ی ئادار روویدا.

**میهری بەللی:** پێش ئەوە تۆ لەگەڵ یڵدز بووی، وانەبوو...؟

**عەبدوڵڵ نۆچ نالان:** نا من لەدیاربەکر کارم دەکرد لە بەڕێوەبەرایەتی تۆمارکردنی تاپۆ.

**میهری بەللی:** کەواتە پەیوەندی لەگەڵ یڵدز لەقۆناخی دوای ئەوە دێت..؟

**عەبدوڵڵ نۆچ نالان:** یڵدز نا، من ئامادەیی هونەریم لەئەنکەرە تەواوکرد و بۆ ماوەی ساڵێك دامەزرام. دوایی داوای خۆنووسینم کرد لە کۆلیجی ماف، بەلاّم من بەباشی بەردەوام نەبووم، لەساڵی 1970 پەیوەندیم کرد بە کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێڕی رۆژهەلاّت، هەروەك ئاماژەتان پێکرد بەهیچ شێوەیەك ناوی گەلی کوردیان نەدەهێنا، پێیان دەووت "گەلی رۆژهەلاّت" کاتێك ووتم: گەلی کورد بەگومانەوە سەیریان دەکردم و پرسیاریان کرد: بۆچی ئەم وشە تیژانە بەکاردەهێنی...؟ منیش ولاّمم دانەوە و ووتم: مافی گەلان بۆ بڕیاردانی چارەنووس، ئەوە مافێتی بۆ بونیادنانی دەوڵەتی خۆی،

بۆچــی بەوشــێوەیە بــۆ کــوردان بــیر نەکەینــەوە..؟ زۆر بەسەرســوڕمانەوە گومانیان دەکرد، ئەمە ساڵی 1970 بوو و، سەرەتای ساڵی 1971 بوو.

ڕەوشی من لەئەستەنبوڵ بەم ڕەنگە بــوو، دواتــر خــۆم بــەو پەرتووکانــەی لینین خەریك کرد کە باس لە مافی گــەلان دەکات لــەبڕیاردانی چارەنووســیان. ئــەوەی باســتان کــرد ڕاســتە، مــن گــوێم گرتبــوو لــە کۆنفرانسێکی "حیکمــەت قفلجملــی" ئــەم زاراوەیــەی تێــدا دووبــارە کــردەوە: لاوانــی میزۆپۆتامیــا، بــە هەمووو شێوەیەك خۆی دوور دەگرت لە وتەی لاوانی کورد، من بۆخۆم ئــەوەم دی، لەو کاتانــەدا هەنــدێك ئەنــدامانی لاوانــی شۆڕشگێڕم بــینی لەکاتێکدا کــە جیابوونەوە لەنێوانتانــدا دەســتیپێکردبوو. لــەکۆلیجی ئەنــدازەی تــەکنیکی لــە ئەستەنبوڵ من گوێم لێگرتن، لەیادمە چەکیان بەکارهێنا و فیشەکیان تەقاند، نــازانم ئێــوە ئــەوەتان لــەبیرە..؟ هــەر سێ ماهیرچایان و یوســف و کــازم ئــۆزۆ دۆغرو بوون. باوەڕدەکەم کە کۆبوونەوەی جیابوونەوە بوو.

**میهری بەللی:** بێگومان تۆ دەزانیت یوسف لەدوایدا چی کرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بــەڵێ... بــەڵام بــەلای منــەوە مــاهیر توونــد و زاڵ بــوو، خەریکبوون و گرێدانی من بەمەسەلەی کورد و دۆستایەتیم بۆ پارتی ڕزگــاری گەلی تورکیا ـ بەرە، بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو گرێدراوی هەڵوێستی ماهیرە لە خستــنەڕووی پرســەکە. باوەڕدەکــەم مــاهیر پەیوەنــدی لەگــەڵ ئێــوە هــەبوو، هەندێك ڕەخنەشی هەبوو، بەڵام من ناوەرۆکەکەی نازانم چییە؟

**میهری بەللی:** هیچ کاتێك گفتوگۆ لەنێوان من و ماهیردا دەرنەکەوتووە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەوەی مەبەستمە ئەوەیــە کــەمن زۆر بەباشــی هەســتم بــە بــەهای لاوانــی شۆڕشــگێڕ کــرد، زۆر بەگــەرمی پێیــەوە گرێــدرام، بێگومــان نــەدەکرا پەیوەنــدیم پێیانــەوە لەچوارچێوەی ســۆزێکی دابــڕاو بوایــە، لــەوەش زیاتر کودەتای 12ی ئادار زۆر نزیك بوو، ئەوەی ووتم لەو زستانەدا پێکهات و لە 12ی ئاداردا کودەتاکــە ڕوویــدا، لەوکاتــەی کودەتاکــە هەســتا بــەلێــدانی ملــی لاوانی شۆڕشگێڕ، ئێمە بەختمان هەبوو تەنها نینۆکیان کردین.

سەبارەت بــەماوەی 1970 ــ 1980 شــتێك هەیــە بخــوازن زیــادی بکــەن و بیلێن ..؟ بۆئەوەی بەدوای ئەوەدا پێناسەی پارتی کرێکارانــی کوردستان بکــەم، سەبارەت بەو ســاڵانە دەتوانیــت چــی بڵێیــت....؟ ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایــەتی و بزووتنەوەی چەپ ـ سۆسیالیستی گوزارشتیان لەچی دەکرد.

**میهری بەللی:** ئەوەی گرنگە ئەو ڕووداوانە بگەیەنرێنە ڕۆژگاری ئەمڕۆ و بەشێوەیەکی ڕاست تەواو بکرێن، لەو ساڵانەدا بــۆ چــەند جارێــك مــن چــوومە تورکیــا و لێــی دەرکــەوتم، لــەو کاتانــەدا ئەجەویــد ئەمــەی بلاوکــردەوە: کــارە ئۆغلان هیوا لەوڵاتدا بلاودەکاتەوە. ئــەو پڕوپاگەندەیــەی ئــەوە دیــاری دەکــات

کە بەرخودانی لەبەرامبەر فاشیزم کردووە، دەرکەوت کە پیاوی موخابەراتی ئەمەریکایە، ئەگەرنا چۆن دەتوانێت ئەوەندە جموجوڵ بکات، لەکاتێکدا دەوڵەت ئەوەندە ئامادەکاری کردووە، لەدوای ئەوە کە ئیتر کەسی نەبینی لەکۆبوونەوەکاندا چەپڵەی بۆ لێبدات کە لێرەو لەوێ پێکی دەهێنا، وازی لەو پڕوپاگەندانە هێنا. من لەتورکیا بووم، بڕیارمدا کە نامەیەك لەدەرەوەی وڵات بنێرین بۆ ئەجەوید لەڕێگەی مستەفا ئەکمەکچی کە نزیکی بوو، ئێستاش سکرتێری رۆژنامەی میللیەتە.

**عەبدوڵڵا ئۆچ ئالان:** ئەو ئۆزکۆك بوو...؟

**میهری بەللی:** نەخێر من بە ئاڵتان ئۆیمانم ووت: بەو پیاوە بڵێ هیچ داوایەکی تۆ رەت نەکاتەوە. تۆ جنێو بەپیاوێك دەدەیت کە بە بەکرێگیراوی دادەنێیت..تۆ ئەمڕۆ سەرۆکی پارتیت و رۆژێك ئێوە لە پلەی وەزیردا بوون، دەزگای ئیستخباراتی (هەواڵگری) ئێوە لەدەزگای ئێمە بەهێزترە، باس لەوە نەکە کە هەندێکیان بەکارهێنا بۆ ئاراستەکردنی جنێو و سووکایەتی بۆ ئەوانەی لەلایەنی چەپەوە رادەوەستن، لەجیاتی ئەوە هەندێ بەکرێگیراوی CIA دیاری بکە و پەردەیان لەسەر لابدە، ئەمە ئەرکێکی نیشتمانییە، هەروەها ووتم: ئێمە ناتوانین بۆ بێزاریمان لە کێچ هەموو شتێك بسووتێنین. رەوشی وڵات بەمەترسی بوو.. لەسەرەتادا هەندێك لەبەرخودان، پاڵیان پێوەنابن بۆ ئەم رەوشە.

**عەبدوڵڵا ئۆچ ئالان:** دەڵێن چەپ لەژێر کۆنترۆڵ دەرکەوتبوو.

**میهری بەللی:** دەوترێت ئەجەوید جارێکیان نامەیەکی لەبەر گوێی ئاڵتان ئۆیمان و ئەکمەکچی خوێندبۆوە، کە تیایدا هاتبوو: پیاوەکانی ئەم و ئەوە دەڵێن.

**عەبدوڵڵا ئۆچ ئالان:** لەوانەیە.

**میهری بەللی:** لەزیندانەکان کەسانێك دەرکەوتن و دەیان ووت: "سوڵتان عەبدولحەمید وڵاتپارێز بوو، بەڵام میهری بەللی خائینە، دیمیریل وڵاتپارێزە" وەکو شێت بووبن.

**عەبدوڵڵا ئۆچ ئالان:** موخابەرات وای لێکردبوون ئەو شتانە بڵێن، قسەکانیان هیچ نرخێکی نییە، لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە کە رێکخستنی ناوەندی گروپەکان بڵاوبۆوە و لاوانی شۆڕشگێڕ لەژێر کۆنترۆڵ دەرکەوتبوون. جووڵەی ئەجەوید و کارە ئۆغلان دوای کودەتای 12ی ئادار، دەیانویست ئەو وزانە بدزن و بەخۆیانەوە گرێی بدەن، گروپەکان زۆر زیاتر بڵاوبوونەوە، سەرۆکایەتی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی پاکتاوکرا، ئێوە ئەوکاتە لەکوێ بوون...؟

**میهری بەللی:** من لەوکاتەدا لەزیندان دا بووم.
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** بەو رەنگە چەندە مایتەوە..؟
**میهری بەللی:** سەد رۆژ.
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** بەڕاستی غەریبە.
**میهری بەللی:** سەد رۆژ بەچەکەوە گیرام.
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** بەڵێ، بەڵێ، تۆ بەچەکەوە دەگەڕایتەوە بۆ وڵات.
**میهری بەللی:** لە رێگەی گەڕانەوە بۆ و وڵات.
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** لەکاتی گەڕانەوە بەچەکەوە بەو هیوایەی هەڵمەتێکی نوێ دەست پێ بکەن.
**میهری بەللی:** بەو شێوەیە بەگوێی مندا چرپاندیان.
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** ئەوە لەکام ساڵە دابوو..؟
**میهری بەللی:** ئۆکتۆبەری 1971...؟
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** لەبەرامبەر فاشیزمی 12ی ئادار.
**میهری بەللی:** هەوڵدانێکی بێ ئومێدبوو، بەڵام پێویست بوو.
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** درەنگ بوو.
**میهری بەللی:** درەنگە یان نا گرنگ نییە... گرنگ..
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** بەڵام جێگای بایەخ بوو، من بڵند ئەینرخێنم...
**میهری بەللی:** بۆ ئامـاژە دەڵـێم ئەوانـەی لەگەڵمـدا هـاتن خـاوەنی کەسایەتیەك نەبوون کە بەرپرسیارێتی هەڵبگرن.
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** مەبەستت لە گروپی سامان داغە، نا...؟
**میهری بەللی:** دوانزە کەس لەو گروپە، ساتان بە بەراود لەگەڵ ئەوانی تر لە هەموویان باشتربوو، لاوێکی کامڵ بوو، بڕیاربوو ئەوانی تر بگەیەنمە چیای گـاور پێویسـت بـوو پێیـان بڵـێم "ئـەرکی مـن لێـرەدا تـەواو بـوو، پێویسـتە بگەڕێمەوە".
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** ئەو گروپانە چییان دەکرد.
**میهری بەللی:** ئەرکی من تەنها هاریکاریکردنیـان بـوو کـە بەباشـی بگەنـە جێگای خۆیان. بەڵام کاری رێکخستن بڕیاربوو بەکادێرەکانی خۆم بیانکەم.
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** لەوانەش تێکۆشانی چەکداری...؟
**میهری بەللی:** من بەکادێری خۆم پێی هەڵدەستام.
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** بەو رەنگە..؟
**میهری بەللی:** ئەرکیان بەو شێوەیە بوو، پیاوی ئەو کارە نەبوون.
**عەبدوڵڵ نۆج ئالان:** واتە، دەتانوسیت بەکادێرە رەسـەنەکان ئـەو کارەبکـەن و، گەریلایەکی بەو رەنگە بونیادبنێن.

**میهری بەللی:** هەبوو، بەڵام لەگەڵ هەمووشتێکدا، کارێکی بێ ئومێدبوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بێگومان هەنگاوێکی بێ ئومێد بوو.

**میهری بەللی:** بۆ نمونە پرسیاریان دەکرد: باشە ئەم کارە چۆن بەڕێوە دەچێت..؟ تۆ وای دابنێ کە گروپەکان لە موسڵ کۆبوونەوە و ئامانج بنکەی ئینچەرلیك بوو، هەنگاوی دوای ئەو چییە..؟ دوای گەیاندنی گروپەکان بۆ شوێنەکانیان و تەقاندنی کاتیۆشا، من زۆر دڵنیا دەبووم. کاتێك دەهاتن پێیان دەڵێم: مـن ئـەرکی نیشتمانیانەی خـۆمم ئـەنجام دا، ئێـوەش ئـەو ئەرکـەی لەسەرشانتانە پێکی بهێنن.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** تێڕوانینێکـی زۆر تەسـکە..! بەڕاسـتی گەریلایـەکی سەرسووڕهێنەرە. لەکاتێکدا دەتـانتوانی بیر لـە بەسـتنی پەیوەنـدی بکەنـەوە لەگەڵ گوندییە هەژارەکان. بەهەنگاوێکی بەو رەنگە گـەریلا دەیتـوانی لەسـەر پێ خۆی رابگرێت.

**میهری بەللی:** بۆ زانین ئـەو جێگایـەی کـە بـۆ ئـەو کارە دەسـتی دەدا زۆر بوو. لە کورجیك ـ مەلاتیە بەڕاستی جێگەی زۆر باش هەبوو، خـانووی ئـەوێ لە گرانیتی رەش پێك دێت، دیوارەکانی دەتوانێت خۆی لەبەرامبەر تۆپ باران رابگرێت. سینان لەیەکێك لەو خانوانەدا خـۆی شـاردبۆوە، لـەژوورێکی دیکـەدا تەسلیم تۆرە و لەسێیەمیشدا ئیبراهیم قایباق قایا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەو رەنگە...؟

**میهری بەللی:** دۆغو پەرینچەکیش لەژوورێکی دیکەدا بوو لەگەڵ گروپێك لە کچان و کوڕان کە تیایدا وێنەی من هەڵواسرابوو.

**عەبدوڵڵا نـۆچ ئـالان:** ئـەوەی لێـرەدا گرنگـە، نیـاز هـەبوو شـەڕی گـەریلا دەستپێبکەن، هەرچەندە درەنگیش بوو.

**میهری بەللی:** نیاز هەبوو... بەڵام بۆ پاراستنی روو سووری بوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەو شـێوەیە بـوو، باوەڕدەکـەم کـە ئێـوە لـەدوای ئـەوە هەستان بە دامەزراندنی پارتی کار. ئەوە لەکام ساڵدا بوو.

**میهری بـەللی:** دوای هاتنمـان، پـارتی کـاری تورکیمـان دامەزرانـد، زۆریـان لێکـردین کـە ئـەو هـەنگاوە بهاوێـژین، لەڕاسـتیدا هـەموو ئـەو کادیرانـەی لەگەڵماندا بوون هەڵبژاردە بوون و لەریزەکانی پێشەوەی تێکۆشـەرە لاوەکانـدا جێگـەی خۆیـان گرتبـوو. هـەمان ئەوانـە بـوون کـە لـەقۆناخی کودەتـای 12ی ئادار بە نهێنی لەگەڵیاندا ژیابووم، بـەڵام ئـەوەی روویـدا لـەماوەی دوای ئـەوە روویدا، هەندێکیان کەوتنە ژێر کاریگەری دەرەکی و، هەرچی لەدەستیان هـات کردیـان بۆئـەوەی ئـەو هـەنگاوەمان بتەقێننـەوە کـە هاوێشـتبوومان. داوای داخستنی پارتییان بڵند کردەوە. هەر لەڕۆژی یەکەمی دامەزراندنەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەوە لە چ ساڵێکدا بوو..؟

**میهری بەللی:** 1974 ـ 1975

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** لەڕاستیدا هەنگاوێکی پۆزەتیف بوو.

**میهری بەللی:** پۆزەتیف بوو، لەگەڵ دامەزراندنی پارتیدا وشەی "**کورد**"مان خستە ناو پرۆگرام.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** لەبیرمە. هەربۆئەوەش داوایان لە دژی بەرزکردەوە.

**میهری بەللی:** دۆزیان بەرزکردەوە و داوایان لێکردین ئەو وشەیە لە بەرنامەکە دەربخەین، ئێمە ڕەتمان کردەوە و ئاماژەمان کرد بۆ بەندی بڕیاری یەکسانی کە لە یاسای پارتە سیاسیەکاندا هەبوو. چونکە لە دەستووردا ماددەیەك هەیە بەکارهێنانی وشەی "کورد" قەدەخە دەکات. پەسندمان نەکرد دەریبخەین، داواکەیان بەرزکردەوە و، داوای دەفتەری پارتی و سجیلەکانیان لێکرین بۆ پێشکەش کردنی لە داگایەکی سەربازی دا، لەژێر دۆسییەی: "دۆزی داخستنی پارتی" بەپێی هەردوو ماددەی 141 ــ 183 ئێمە ڕەتمان کردەوە و ووتمان: "تاکە دەزگا کە ڕێدراو بێت بۆئەوەی لەدۆزی داخستنی پارتی بڕوانێت دادگای دەستوورییە". ماددەیەکی تایبەت هەیە لەیاسای ئیفلاس ژمارەکەیم بیرناکەوێتەوە، تیایدا هاتووە کە کەسی ئیفلاسی کرد، شەش مانگ بکەوێتە زیندان، ئەگەر دەفتەرەکانی خۆی پێشکەشی دادگا نەکات. منیان خستە زیندان. لەساڵی 1976 چەپەکانمان پارچە بوون بۆ چوار گروپ. لەنێو گروپی سوپای ئازادی کرێکاران و جووتیارانی تورکیا دوو گوندی هەبوون، من ئەوانم دەناسی، باشم بینی لەگەڵیاندا بژیم. بەڕاستی لەگەڵ ئەو گروپە ناوبراوەدا مامەوە، ئەم گروپە بە بەردەوامی گوێی لە رادیۆی ئەلبانیا دەگرت، یەکێك لەئەندامەکانی کە لە فەرەنسا هاتبوو و وەریدەگێڕا و لە ڕێگای زیندانیەکانەوە دەینارد بۆ گروپەکەیان لە گەرەکە گەلێریەکان. ئەوانەی دەیان نووسی بەم ڕەنگە بوو، ئەوانی تر هەموویان خائینن هەلپەرستن، تەنها ئێمە کۆمۆنیستین. ماو و ئەنوەرخۆجە چیان گوتووە ئایەتی پیرۆزە، ڕەوشێك بوو کە بێزاری دروست دەکرد، بڵاوبوونەوەیەك بوو بێ هیوایی لای مرۆڤ دەچاند.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەوە لەساڵی 1970دابوو.

**میهری بەللی:** 1976

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** دوای ئەوە چی تر..؟

**میهری بەللی:** دوای شەش مانگ دەرکەوتم و جارێکی تر کارەکانم گرتەوە دەست، زۆر بە دۆزی گرتنی پارتی خەریك بووم.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەکورتی بەبەردەوامی لەنێو ریزەکانی بزووتنەوەدا بوون.

**میهری بەللی:** بەکورتی دەست پێشخەری بەبەردەوامی لەدەستی دوژمندا بوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** دەست پێشخەری لەدەست دوژمندا بوو، چونکە دادوەرەکان لەریزی ئەو دابوون.

**میهری بەللی:** بۆئەوەی جیابوونەوە و بلاوبوونەوە بەردەوام بێت، هەندێک هەبوون چی پێویست بوو دەیانکرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** دزە، پارچە بوون و جیابوونەوە، هەتا سەرمل هاتبوو.

**میهری بەللی:** بەرێژەیەکی ترسناک.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەخوازن ئاماژەی بۆ بکەن..؟

**میهری بەللی:** بەڵێ..

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** با وابێ دەست پێشخەری لەدەستتان دەرکەوت و پارچەبوونیش زێدە دەبوو.

**میهری بەللی:** رەوش بەو رەنگە بوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** قەرەباڵغیەکی گەورە.

**میهری بەللی:** رێگای شۆرش، کە لە رواڵەتدا وەکو رێکخستنێکی زەبەلاح دیاردەبوو، دەرکەوت پووچە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەتەواوی پووچ نەبوو...؟

**میهری بەللی:** بەڵێ پووچ بوو..

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ناوێکی دیکە هەیە...؟

**میهری بەللی:** نەخێر، لەوکاتەدا نەمان بینیبوو، بەلام ئەوەی دیاربوو هەموو دەرگاکان لەبەردەمیدا کراوەبوون، بەلام لەسەردەمی 12ی ئادار هیچ بەرخۆدانیەکی نەکرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ، لەدوای کودەتای 12ی ئەیلول بەتەواوی روونبۆوە کە گروپێکی پووچە و لەپارتی رزگاری گەلی تورکیا ـــ بەرە پووچترە.

**میهری بەللی:** لە زانکۆ ئەوروپیەکان لەم سەردەمەی دواییدا شتێک بلاوبۆتەوە کە پێی دەووترێت "چەپی نوێ" زمانحاڵی ئەویش "بیریکیم"ە، کە موراد بەلگە دەریدەخات و بەکەسایەتی ماهیر چایاندا هەڵدەدات.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** گوناهە.

**میهری بەللی:** بێگومان....

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** تێکەڵکردنێکی هزری بێ سنوورە.

**میهری بەللی:** بناخەی ئایدیۆلۆژی نییە، خەباتێکی دابڕاوە، لە پاراستنی بەرخۆداندا ئامادە نییە، بێگومان نکۆڵی لەبەرخۆدانی بنکەکان ناکەین، ئەوانە راستی نەگۆڕن.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بێگومان.

**میهری بەللی:** لەگەڵ ئەوەی لە حەفتاکاندا پارچەبوون دەرکەوت، بەڵام بەرخۆدانی لەبەرامبەر فاشیزم بەردەوام بوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لەگەڵ نەبوونی رێبازێکی سیاسی چەسپاو.

**میهری بەللی:** هەروەها پێداگرتنی ئایدیۆلۆژیش نییە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لە سوپای رزگاری کرێکاران و جووتیارانی تورکیادا هەیە.

**میهری بەللی:** باش نایناسم، بەڵام تێڕوانینی من بۆ ئیبراهیم قایپاق قایا پۆزەتیفە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** مەبەستم پاراستنی ئیبراهیمە لە دادگادا.

**میهری بەللی:** وەك شرۆڤەم کرد لەزینداندا بەیەکەوە بووین، لەکاتی دامەزراندندا لەوێ بووم، بەو رەنگە بوو کە باسم کرد، واتە جیاوازیەکی ئەوتۆی نەبوو لەوەی کە ئێستا تیایدایە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** باوەڕدەکەم ئێوە قۆناخی هەتا حەفتاکانتان لەچوارچێوەی رێبازێکی دیار بەڕێوەبرد، لەچوارچێوەی هەوڵەکانتان بۆ پێکهێنانی گەریلا و دامەزراندنی پارتیەکی ئاشکرا، بەڵام لەگەڵ ئەو زەبرەی کە لاوانی شۆڕشگێڕ لەدوای کودەتای 12ی ئادار بەریانکەوت، بزووتنەوەی سۆسیالیستی تا رێژەیەکی زۆر بێ سەرۆکایەتی مایەوە. دوای دەرکەوتن لە وڵات و دوابەدوای کودەتای 12ی ئادار، کارە ئۆغلان (پارتی گەلی کۆماری) کارەکانی بەڕێوە دەبرد، گروپەکان بەڕادەیەکی زۆر پارچە بوون و جیا بوونەوە.

**میهری بەللی:** لەو کاتانەدا پارتی کۆمۆنیستی تورکیا هەبوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ ئەمە شتێکی سەرسووڕهێنەرە کە لەوکاتەی ئەجەوید کارەکانی گرتەدەست، پاکتاوکردنی پارتی کۆمۆنیستی تورکیا پێشکەوت.

**میهری بەللی:** هەموو دەنگەکان بۆ ئەجەوید بوون.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەتەواوی دەیویست میراتی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی سەرنەکەوتوو بخاتە ژێر دەستی خۆی.

**میهری بەللی:** بێ هیوایی رێکدەخست (کە تووشی دۆڕاوەکان ببوو).

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ بێ هیوایی .. رێکخستنی بێ هیوایی.

**میهری بەللی:** .........

**عەبدوڵلآ نۆچ ئالآن:** بە رێکخستنی بێ هیوایی دەبێتە پردێك بۆ CHP، لەبەرئەوەی گروپەکان رەخنەیەکی تایبەتی جددیان لەقۆناخی رابردوودا پێشکەش نەکرد، پارچەبوون و بەشبوون کارێکی حاشاهەڵنەگر بوو، دەتوانین بڵێین هەوڵەکانتان بۆ دامەزراندنی پارتی کاری توورکی درەنگ بوو. لەکاتێکدا....

**میهری بەللی:** هەر لەرۆژی یەکەمەوە بڕیاری مردنی بەسەردا درا.

**عەبدوڵلآ نۆچ ئالآن:** بەڵێ.

**میهری بەللی:** هەر لەرۆژی یەکەمەوە دادگایی کردنی بەواتای بڕیاری مردن دێت.

**عەبدوڵلآ نۆچ ئالآن:** گرنگە.

**میهری بەللی:** پێش کودەتای 12ی ئەیلول داخرا.

**عەبدوڵلآ نۆچ ئالآن:** بەڵێ.. باوەڕدەکەم هەوڵەکانتان لەگەڵ بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی، بەتایبەت لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا تێکشکا، بەتایبەت دوای ئەوەی ئەو گروپە لەژێر کۆنترۆڵی ئێوە دەرکەوتن و، هێزی رێکخستنی بزووتنەوەی فاشی پەرەی سەند.

**میهری بەللی:** بێگومان، دەستپێشخەری کەوتە دەستی ئەوان.

**عەبدوڵلآ نۆچ ئالآن:** ئەوە بێگومانە، بەتایبەت لەماوەی هەردوو بەرەی نەتەوەیی یەکەم و دووەم تاوان یەك لەدوای یەك زێدە بوو، چەپ رۆژ لەدوای رۆژ پارچە بوو، گروپە چەپەکان کەوتبوونە رەوشێك کە پێشبڕکێیان دەکرد لە جنێودان بەیەکتری، ئەمە بەتەنها بەسە بۆئەوەی بێگومان بین لەوەی کە ناپاك بوون، ئەگەر دەخوازیت با ئەم خاڵەش باش شیبکەینەوە، ئەزموونی ئێمە هەیە ناومان برد بە "نینۆك کردن".

**میهری بەللی:** رابردووتان....

**عەبدوڵلآ نۆچ ئالآن:** بەکەمترین زەرەر ئەو ترسەمان تێپەڕاند، کاتێك لەزینداندان دەرکەوتم بۆشاییەکی گەورە هەبوو، بەو رەنگە کودەتای 12ی ئادارمان تێپەڕاند، وەك دەزانن رووداوەکانی قزل دەرە دەرکەوتبوون و، بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی بەشێوەیەکی تراژیدی تیایدا سەرۆکایەتی خۆی لەدەست دابوو، زۆر کاریگەری لەئێمە کرد، تا ئەو کاتەش من سۆزم بۆیان هەبوو، لەکۆلیجی زانستە سیاسیەکان دەمخوێند، لەوکاتەدا بۆ جاری یەکەمین نارەزایەتیمان بەرامبەر 12ی ئادار نیشاندا، دوایش زانکۆی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەدوامانداهات، دوایش بۆ ماوەی شەش مانگ گیرام کە لە 7ی نیسان دەستپێکرد. باقی تۆغ، کە بڕیاری لەسێدارەدانی دەنیز گەزمیشی

دەرکردبوو، داوای 15 ساڵ زیندانی بۆ من دەکرد، تەنها یەك شایەت هەبوو، ئەگەر ببوایە دووان سزاکە بێگومان دەبوو، بەو رەنگەش ئەو مەترسیەم بەکەمترین زەرەر دەربازکرد، زۆر ئەزموونم لەو شەش ــ حەوت مانگە وەرگرت کە لەزینداندا بەسەرم برد.

دوای رووداوی قزل دەرە، لەزینداندا رووداوی لەسێدارەدانی دەنیز گەزمیشم چاودێری کرد، لەو کاتەدا لێکۆڵینەوەم لەسەر پرسی کورد دەکرد، دوای ئەوە دڵنیا بووم کە پارتی رزگاری گەلی تورکیا ــ بەرە ناتوانێت ریزەکانی خۆی بەپەلە رێکبخاتەوە، لە کۆتایی ساڵی 1972 و سەرەتای 1973 باوەڕم هێنا بەوەی کە ئاواکردنی گروپێك لە رۆشنبیران لەسەر راستی کوردستان هەنگاوێکی باش دەبێت بۆ بەدەستهێنانی ئەنجام، بەڕای من لەو قۆناخەدا گرنگترین هەنگاو بوو، چەپی تورك سەرۆکایەتی خۆی لەدەستدا بوو و بەدەست پارچەبوون و بڵاوبوونەوەوە دەیناڵاند، پەیوەندی کردنی من وەکو تاکێك هیچی لەئەنجام نەدەگۆڕی، بۆئەوە بیرم دەکردەوە کە چارەسەرکردنی راستی کورد ــ کە وەکو زەویەکی بەکار نەهاتووە ــ لەسەر راستی و رۆشنایی ئەزموونی شۆڕشگێڕی تورکیا و پراکتیزەکردنی لەسەر راستی کوردستان دەبێت، لەژێر تێزی "شۆڕشی نیشتمانی دیموکراسی"، ئەمە گەورەترین و راسترین هەنگاو دەبوو، لەسەر ئەم بناخەیە ئازایەتی خۆمان کۆکردەوە و ئەو گروپەمان دروست کرد، کارێکی زۆر گران بوو، بەڵام ئێمە لەسەرەتای ساڵی 1973 بڕیارماندا و هەر لەبەرهاری ئەو ساڵەدا و بێ ئەوەی هیچ ناوێکی لێبکەین لە پێکهێنانی ئەو گروپەدا سەرکەوتین. ئەنجام: هەندێك پێشکەوتن ئەگەر لەسەر خۆبێت لەساڵانی 1973 ــ 1974 ــ 1975 پێکهاتن، ئەمە باشترین وەڵام بوو لەپێناوی پرسی نەتەوەییدا.

لەهەمان کاتدا رزگارکردنی ئێمە بوو لەم رەنجە بێهودە و ئانارشیزمی چەپی تورکی. تا ئەوکاتەش بەهیچ شێوەیەك لەبزووتنەوەی لاوانی تورکیا جیانەبووینەوە. من سەرۆك و دامەزرێنەری راستی کۆمەڵەی قوتابیانی خوێندنی باڵای شۆڕشگێڕی دیموکراسی بووم لەئەنقەرە، کە لەدوای کودەتای 12ی ئادار رۆڵێکی گرنگی پیادە کرد، واتە من بەڕاستی رۆڵی سەرۆکایەتیم لەناو بزووتنەوەی لاواندا پێکدەهێنا. لەلایەك بۆ وەلامدانەوەی رووداوەکانی قزل دەرە هەستاین بە بیناکردنی رێکخستنی جەماوەری دیموکراسی، لەلایەکی دیکەوە چالاکیمان لەپێکهێنانی کۆمەڵە کوردیەکەدا نواند، هەردوو کارەکەمان لەیەك کاتدا ئەنجامدا کە ئەمەش بەڕای من هەتا ئێستاش راسترین تێڕوانینە، پەیوەندیمان لەگەڵ گەشەکردنی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی دیموکراسی تورکیای بەرفراوان نەبڕی، لەکاتێکدا کە رێکخستنی تایبەتمان بۆ

پرسی نەتەوەیی کورد دروست دەکرد، واتە بەپشت بەستن بەڕاستی کوردی، ئەمەیە هەڵوێستی خوڵقکاری، ئەمە ئەو تایبەتمەندیەیە کە بەدەر لەهەمووان رەنگ رێژم کرد، کەس نەبوو باوەڕ بە سەرکەوتنی ئەم هەنگاوە بهێنێ، هەتا ئەو کاتەش نەناسرابووین، من باوەڕیەکی تەواوم هەیە کە ئێمە بەو هەنگاوەمان لەسەر ئاستی پرسی نەتەوەیی بۆشاییەکی مێژوویی گەورەمان پڕکردەوە، ئەمەش بەختی ئێمە بوو کە نەیهێشت بکەوێتە تۆڕی ئەو ململانێیەی لەنێوان گروپەکاندا هەبوو و هاوکاری کردین بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە کە بزووتنەوەی لاوان بەجێی هێشتبوو، بەو شێوەیە ئێمە لەدوو بواردا لەناوەڕاستی حەفتاکاندا سەرکەوتنمان بەدەست هێنا. یەکەمیان؛ پراکتیزەکردنی تێزی ئێوە سەبارەت بە شۆڕشی نیشتمانی دیموکراتی لەسەر راستی کوردی. دووەمیان؛ پراکتیزەکردنی هەڵوێستی ئێوە بۆ بزووتنەوەی لاوان. ئەمەش لەناوەڕاستی حەفتاکاندا بەگوێرەی ئەو رەوشەی کە دەردەکەوت. راستە ئەم هەنگاوە دە ساڵ درەنگ بوو، یاخود دەتوانین بڵێین دوای دە ساڵ دووبار بۆوە، بەڵام لە راستیدا هەنگاوێکی سەرکەوتوو بوو.

**میهری بەللی:** ئێوە پێداگرتنێکی بڵندتان نیشاندا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** پێداگرتنێکی بڵند، لەگەڵماندا هەڤاڵی توركی دڵسۆز هەبوون لەنمونەی حەقی قەرار و کەمال پیر، من هەڤالانی تورکم لە گروپەکەدا بەشدار دەکرد، کە دامەزراندنی بوو بە سەرەتای قۆناخێکی نوێ، ئەمەش بۆخۆی رەوتێکی نوێ بوو لەساڵی 1970دا و شایەنی سەرنجە و، سەرکەوتن و ئەنجامی بەدەست هێنا، لە راستیدا رێکخستنەکانی رێگای شۆڕشگێڕی کە زەبەلاح بوو هەروەها پارتی کۆمۆنیستی تورکیا و بزووتنەوەی رزگاری گەلی تورکیا هەموویان لێدران و تێکشکێنران، لەکاتێکدا کە ئێمە لەبەرامبەر ئەو رێکخستنانە گروپێکی بچووك بووین ئەوانیش بەتەواوی گۆڕەپانەکەیان لەدەستدا بوو، بەڵام بەهۆی راستی هەڵوێستمان و وانە دەرخستن لەکودەتای 12ی ئادار هەلی بەپەلەمان دەست کەوت بۆ گەشەکردن. لەو کاتەدا من پێم دادەگرت لەسەر پێك هێنانی رێکخستنێکی دوور مەودا بەبێ دەستبەردان لەکارە گشتیەکان. واتە کاری سەرتاسەری و بەرفراوان، من هەردووکیانم لەناویەکدا کۆدەکردەوە، لەو سەرەتایەوە کە ئەمە کارێکی سۆسیالیستی راستە بۆ ئەم قۆناخە، ئەمە ئەو ئەنجامە بوو کە بەدەستم هێنابوو لەو پەرتووکە تیۆریانەی خوێندبوومەوە. گرنگترین سیمای قۆناخی دوای ساڵی 1975 واتە ئەو قۆناخەی لەساڵی 1975 بۆ ساڵی 1980 درێژ دەبێتەوە. ئەمانە بوون: بەهێزبوونی رێکخستنی بزووتنەوەی فاشی، بەتایبەت کە لە سەرەتای شەستەکاندا پارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی دەستی

بەسەردا گرت و، پارتی گوندیەکانی کۆماری دامەزراند، هەروەها دامەزراندنی کۆمەڵەکانی دژایەتیکردنی کۆمۆنیزم و ئەم کۆمەڵانە بوونە جێگەی نوخبە. هەموو ئەم پێشکەوتنانە دەرکەوتن دوای ئەوەی تورکێش پەروەردەیەکی تایبەتی لە ئەمریکا بینی. بەتایبەت لەسەر کۆنتر گەریلا لەسەر دەستی موخابەرات (هەوالگری)ی ئەمریکی لەسالی 1949، کە لەو کاتانەدا لەناو سوپای تورکیادا ئەفسەرێکی پایەبەرز بوو، دوای سالانی پەنجاکان لەشاری ئەلعەزیز مایەوە و بەشی پەیوەندییە جەماوەرییەکانی دامەزراند، شیمانەی زیاتر ئەوە بوو کە لەناو دەزگای شەڕی تایبەتدا کاری بەرەنگاربوونەوەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیان پێدا بوو، لەدوای کودەتای 27ی ئادار بوو بە ئەفسەرێکی چالاك، ئەگەر لەتوانایدا بووایە کودەتاکەی دەکردە کودەتایەکی فاشی، بەلام مەعدەن ئۆغلو و گروپەکەی بەرپەرچیان دایەوە و ئەو هەلەیان پێنەدا، لە دوای سەرنەکەوتنی تورکێش لە پێکهێنانی خواستەکانی لەگەل هەولی کودەتا یەك لەدوای یەکەکان، هەستا بە دروستکردنی بزووتنەوەی فاشی مەدەنی کە زۆر ناسراو بوو، لەکاتێکدا لەناو سوپاشدا پایەی بەهێزی بۆخۆی دروستکرد. پەیوەندی بەهێزی بە موخابەراتی ئەمریکیەوە هەبوو، لەچوارچێوەی ئەو نمونەیەی کە لەجیهاندا زال بوو، بەئامانجی تێکشکانی کۆمۆنیزم و تاکتیکی لێدانی بەدەستێکی پۆلایین لەهەر شوێنێك کە رێکخستن بونیاد بنێت، لەسەر ئەم بنەمایە بناخەی بزووتنەوەی فاشی لە شەستەکاندا دامەزراند و، بە کەوتنە نێو حەفتاکان کادێرەکانی دەرخست لەدوای ئەو بزووتنەوەی نوخبە گۆڕدرا بوو بۆ بزووتنەوەیەکی چالاك، لەدوای هەردوو حکومەتی بەرەی نیشتمانی یەکەم و دووەم کە تیایدا رۆلی وەزیرێکی گرتبووە دەست. بەگەیشتنە 12ی ئەیلول و لاوازبوون و بلاوبوونەوەی چەپ، بزووتنەوەی فاشیزمی نەتەوەیی بەهێز بوو بەتایبەت لەسەر ئاستی رێکخستن، لەچوارچێوەی ئەو پەیوەندیە بەهێزەی لەگەل کۆنتر گەریلادا هەیبوو، لێرەدا بەکورتی دەمەوێ ئاماژە بە رێکخستنی کۆنتر گەریلا لەو سالانەدا بکەم، هەرچەندە ئەم رێکخستنە لەکاتی کودەتای 12ی ئاداردا هەبوو، بەلام ئەو لە سالی 1975 رۆلی سەرەکی خۆی پێکهێنا، وەك دەزانرێت هەولدانێکی کوشتنی سەرنەکەوتوو دەرکەوت کە ئەجەویدیان بەئامانج گرتبوو، خۆیان ئامادە کردبوو کە هێرشێکی بەرفراوانی گرتن دژی ئێمە ئەنجام بدەن، لەو سەردەمەدا بوو کە نامیق کەمال ئەرسۆن بە هەولی کودەتاکە هەلسا، لەو چوارچێوەیەدا دەوروبەری مالێکیان گرت کە من و هەردوو هەڤال کەمال پیر و مستەفا قەرەسوو تیایدا دەماینەوە، هەر لەو کاتانەدا رەشەکوژی 1ی ئایار دەرکەوت لەسالی 1977، ئەمانە هەموویان

نیشانیاندا کە کودەتایەکی فاشی جددی بەڕێوەیە، دوای ئەوە زنجیرەیەك تاوانیان ئەنجامدا کە زۆرتر ئەندامانی پارتی کرێکارانی تورکیا بوونە ئامانج، هەروەها لە چوارچێوەی پیلانێکی ورد و داڕێژاو ئێوەیان بەئامانج گرت.

**میهری بەللی:** لەساڵی 1979.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ.. لەساڵی 1979دا بوو، گرنگ ئەوە بەردەوامی ئەو هەوڵە بوو کە لەساڵی 1977 دەستی پێکردبوو.

**میهری بەللی:** من وای دەبینم کە لە ساڵی 1975 دەستی پێکرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** من باوەڕیەکی تەواوم هەیە کە ئەوان لەسەر فەرمانی دەزگای شەڕی تایبەت ئێوەیان کردە ئامانج.

**میهری بەللی:** بێگومان.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەگینا تەنها چالاکیەك نەبوو گروپێکی فاشی پێکی بهێنێ.

**میهری بەللی:** ئەمە کاری تورکێش نەبوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئێوە بێگومان باش دەزانن کاری ئەو نەبوو، لە ڕاستیدا بەم کارە ویستیان پاکتاوکردنی چەپ بگەیەننە لوتکە. لە ڕاستیدا بڕیار بوو کودەتای 12ی ئەیلول لە ساڵی 1977 پێکبهێنن. هۆکاری پێك نەهێنانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونی بەرەی نەتەوەی کە هانایان بۆی برد، ئەجەویدیان لە ساڵی 1978 کردە سەرۆکی وەزیران. ئەم دوو ڕووداوە کودەتاکەیان دواخست، بێگومان ئێمە ئەم هەلەمان بەکارهێنا و هێزی خۆمان پتەوکرد، ئەمەش سەردەمی سەرۆکایەتی ئەجەوید بوو، بەتایبەت دوای ئەوەی بەشێوەیەکی ڕێژەیی تاوانی کۆنتر گەریلا کەم کرایەوە، لە 2ی تەمموزی 1979 دەرکەوتم بۆ گۆڕەپانی دەرەوە. بەم شێوەیەش ئەو قۆناخە مەترسیدارەم تێپەڕاند.

**میهری بەللی:** لە ساڵی 1979دا دەرکەوتن؟

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لە 2ی تەمموزی هەمان ساڵدا بوو، بەم شێوەیە ئێمە ئەو قۆناخەمان دەرباز کرد و ئێوە ڕووبەڕووی هەوڵدانێکی کوشتن بوونەوە.

**میهری بەللی:** لە نیسانی ئەو ساڵەدا ئێوە لە دیاربەکر بوون؟

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ.

**میهری بەللی:** منیش لەوێ بووم.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** باشە تۆش دوای ئەوە بوویتە ئامانج..؟

**میهری بەللی:** بەڵێ.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەمە زۆر گرنگە، چونکە لە چوارچێوەی ئەو شاڵاوی پاکتاوکردنە بوو کە لەپێش کودەتا دەرکەوت بۆ لەناو بردنی هەموو

ناوەندەکانی بەرخۆدان. لەو کاتانەدا من دەمووت: مەسەلەکە زۆر درێژ ناکات چەند مانگێك دەربار نابێت و کۆتاییمان پێ دێت، ئەگەر دەرگایەك بۆ دەرکەوتن بەرەو رۆژهەلاتی ناوەڕاست ببینین بەڵکو بواری مانەوەمان دەست بکەوێت، من لەپلەیەکی بڵنددا وشیار بووم و دەمێك پێش ئەوەی 12ی ئەیلول بێت بڕیارمدا و پاشەکشەم کرد، بە تێروانینێکی تر ئەو وانەیەی کە من لە کودەتای 12ی ئادار دەرم خستبوو، فێری کردم پاشەکشە بکەم بۆ سەنگەرەکەم پێش هاتنی..

**میهری بەللی:** تۆ جێگای خۆت لە سەنگەردا گرت...

**عەبدوڵا نۆچ ناڵان:** بڕیارێکی لە جێگای خۆیدا بوو، ئەو ئەنجامەی کە بەدەستم هێنابوو ئەمە بوو: پێویستە نەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ماهیر و ئەوانی تر پێی گەیشتبوون. باوەڕدەکەم ئەم هەنگاوە وای لێکردین بۆ جارێکی تر دەست بە قۆناخێکی مێژوویی بکەین، لەکاتێکدا ئێوە لەرەنجتاندا بەردەوام بوون، لەگەڵ ئەوەی بڕیاری کوشتنتان درابوو، پێم وایە ئەوانە لە رێگەی هەندێك کەسەوە کە لەناو گروپەکانی تردابوون چاودێری ئێوەیان دەکرد. وەکو تێبینیتان کرد هیچ کام لەو گروپانە بەرخۆدانیەکی شایانی باسیان نەکرد نە لەکاتی بەرپابوونی کودەتای 12ی ئەیلول و نە لەدوایشدا.

**میهری بەللی:** بەڵێ... هیچ بەرخۆدانییەك نەبوو.

**عەبدوڵا نۆچ ناڵان:** چی روویدا.... لەگەڵ بەرپابوونی کودەتای 12ی ئەیلول خاڵی کۆتایی بۆ مێژووی بزووتنەوەی سۆسیالیستی و لاوانی شۆڕشگێڕ و بەشێوەیەکی تایبەت بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی دیموکراسی تورکیا دانرا، کە پێشکەوتنی بەردەوامی لە ساڵی 1965 دەخولقاند و لە پشتەوە لەگەڵ کودەتای 12ی ئادار لێدانێکی دژواری خوارد کە لەپەلوپۆی خست. دوای ئەو لە گۆڕەپانەکەدا کەسێکی جووڵە بکات نەما. وەك دەزانرێت ئێوە لەو سەردەمانەدا دەگەڕان بەدوای ئاواکردنی یەکێتی و بەرەیەکی بەرخۆدانی هاوبەش دژی فاشیزم، لەو پێناوەدا رەنجێکی زۆرتان دا و تەنانەت چوونە گۆڕەپانی دەرەوە و هاتن بۆ رۆژهەلاتی ناوەڕاستیش، بەلام رەوشی گروپە تورکیەکان روون و ئاشکرا بوو، ئەوەت لەبیردێت؟

**میهری بەللی:** بەڵێ، رەوشی ئەوان ئاشکرابوو. ئەوەی تەنیا نیازی خراپبوو تۆ بوویت.

**عەبدوڵا نۆچ ناڵان:** نیازی خراپ؟! ناوی نیاز خراپیم لێدەکەی؟

**میهری بەللی:** بەمانای نیازی باشی، یان راستترە بڵێین نیاز خراپی بۆ رژێم.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** گروپە تورکیەکان دەیانویست هەرچۆنێك بێ خۆیان رزگار بکەن.

**میهری بەللی:** بیرت دێت..؟ بەیاننامەیەکمان ئامادەکرد و بڵاومان کردەوە، کە تیایدا رستەیەك هەبوو باس لە پیادەکردنی هەموو شێوازەکانی تێکۆشان دەکات لەسەرروویانەوە تێکۆشانی چەکداری.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵکو تاقیکردنەوەی هەموو شێوازەکانی تێکۆشان.

**میهری بەللی:** ئەوکاتە ووتم: "مادام ئاماژە بۆ هەموو شێوازەکانی تێکۆشان دەکات، لەوانەیە تێکۆشانی چەکداری بەبناخە نەگرێت". وەڵامی تۆ بەم شێوەیە بوو. هەموو شێوازەکانی تێکۆشان ئەوانەش دەگرێتەوە کە تۆ ئاماژەت پێکرد. ئەو کاتە ئەو کورتەباڵاکە هەستا ناویم لەبیرنایەتەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** تانەر.

**میهری بەللی:** تانەر ئاقچام.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەوەی رێگای شۆڕشگێڕی پاکتاو کرد.

**میهری بەللی:** ئەو رستەیەی بەتەواوی رەتکردەوە، من وام کرد کە لەکۆبوونەوەکە دەریبکەین لەکاتێکدا هیچ نیازێکی خراپم بۆی نەبوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەمەوێ بڵێم ئێوە شایەتی ئەو قۆناخەن.

**میهری بەللی:** من شایەت بووم و فێربووم کە چۆن بەتەواوی رێکخستنیان پاکتاوکرد.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** وا نییە..؟ پاکتاوکردن چۆن پێکدێت..؟

**میهری بەللی:** پاکتاوکردن چۆن پێکدێت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لەڕاستیدا ئەو قۆناخە بەتەواوی قۆناخی پاکتاوکردنە.

**میهری بەللی:** قۆناخی پاکتاوکردن.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** من بەباشی دەزانم کە هەڵی بسەنگێنن، راستە لە دەروونی ئێوەدا بێزاری دروست کردووە، بەڵام لەبەرامبەر ئەوەدا ئێوە ئەو هەوڵە جددیانە و رێژەی جددیەتتان بینی کە ئێمە خاوەنین.

**میهری بەللی:** بەڕاستی ئێوە جددی بوون..

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** وا نییە..؟

**میهری بەللی:** بەڵێ.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەگەر وورد ببنەوە ئەو هەڵوەشاندنەوە بەئازار و پاکتاوکردنە تراژیدییە دەبینن کە لە هەشتاکان بەدواوە چەپی تورك تووشی هاتن، لەبەرامبەریدا ئەو پێشکەوتنە بەرچاوە دەبینین کە ئێمە پێکمان هێنا، ئێوەش بەبەردەوامی بەجێگەی هیواو ئومێدتان دانا، بەتایبەت کە ئێوە کۆنترین شۆڕشگێڕی تورکیا و یەکێکن لە سیما بەرچاوەکانی، من ناڵێم

لەهەموویان بەتەمەنتری، باوەڕدەکەم کاتێ گوێتان لە دەستپێکردنی 15ی ئاب بوو ئەم هیوایەتان تێدا بووژایەوە و بەهێزتر بوون.

**میهری بەللی:** ئەوکاتە ووتم.. قاچێکی شەیتان شکا، ئەمە هەنگاوێکی مێژوویی گرنگە بۆ شۆڕشگێڕان تەنانەت ئەگەر مانگێك زیاتر بەردەوام نەبێت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ووتتان نا...؟

**میهری بەللی:** ناوزەدم کرد بە "خاڵی وەرچەرخان".

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ.

**میهری بەللی:** ئەوەی بۆ من گرنگە ناوەڕۆکی ئەنتەرناسۆنالیستیە کە بزووتنەوەکەتان لەهەموو گروپەکانی بزووتنەوەی کوردی جیا دەکاتەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەمە زۆر روون و بەرچاوە.

**میهری بەللی:** واتە خواستن و هەوڵەکانتان وەکو ئەوانی تر دوژمنایەتی تورك نەبوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** پێویستی دوژمنایەتی تورکەکان بڵندکردنی تێکۆشان نییە.

**میهری بەللی:** ئەمە بەشێوازێکی ئاشکرا و روون بەرچاو بوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لەوەش زیاتر ژمارەیەکی زۆر هەڤاڵی تورك لەنێو ریزەکانماندان.

**میهری بەللی:** لەکاتێکدا گروپە کوردیەکانی تر ناسیۆنالیزمی سەرەتاییان لێدەتکێ.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** هەروەك چۆن رێکخستنە تورکەکان شۆڤێنیزمی نەتەوەیی سەردەستیان لێ دەتکا، گروپی بزووتنەوە کوردیەکان ناسیۆنالیزمی سەرەتاییان لێ دەتکا، ئێوە ئەو راستیەتان بینی، من بەشتێکی پۆزەتیفم زانی، بێگومان بزووتنەوەکەمان لەگەڵ قۆناخی 15ی ئاب تەنیا بەشکاندنی قاچی شەیتان رانەوەستا وەك ئێوە شیتان کردەوە، هەروەها ئێوە باش دەزانن کە ئێمە تووشی کەوتن نەبووین ئەمەش بواری کردەوە بۆ پێشکەوتنی گرنگ.

**میهری بەللی:** لە تورکیادا رێگا بۆ پێشکەوتنی مێژوویی دەکاتەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەواتای ئێوە ئەوانەتان تێبینی کرد و لەو وتارانەی نوسیبووتان و بلاوتان کردبۆوە هەندێك هەڵسەنگاندنتان ئەنجام دابوو.

**میهری بەللی:** بەڵێ.. من وەك شۆڕشگێڕێکی تورك هەڵوێستێکی پۆزەتیفم لە بەرامبەر بزووتنەوەی بەرخۆدانی کوردی نیشاندا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** هەڵوێستی ئێوە بە بەراورد لەگەڵ رێکخستنەکانی تر نزیکترە لە ئەنتەرناسیۆنالیزم و لەوەش زیاتر هەڵوێستێکی شۆڕشگێڕانەیە،

وەك دەزانن ئەوانی تر PKKیان بەم شێوەیە ناولێكرد، ووتیان: بزووتنەوەیەكی نەتەوەیی وردە بۆرژوازیە. هەروەها هەندێك هەڵوێستی تری نابەرپرسیارانە.

**میهری بەللی:** من نامەیەكم لە یەكێك لە هەڤاڵانەوە بۆهات كە تیایدا هاتبوو: ئەم بزووتنەوەیە بزووتنەوەیەكی رزگاری نیشتمانی كوردستانییە، دوای ئەوەی رێگای كردەوە بۆ سەركەوتن، ئێمە بە شۆڕشێكی سۆسیالیستی تەواوی بكەین".

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەو تورك بوو..؟

**میهری بەللی:** بەڵێ هەڤاڵێكی تورك بوو.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** راستە.. راستە.

**میهری بەللی:** لەو كاتەدا وەڵامم دایەوە و ووتم من باوەڕی بەسەرۆكایەتی ئەو بزووتنەوەیە بكەم كە دەڵێن ئێمەش سۆسیالیستین، یان باوەڕی بە تۆ بكەم؟ بۆچی ئەوانە بۆ خۆیان بە شۆڕشێكی سۆسیالیستی تەواوی ناكەن.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەویش لەقسەكەیدا راستە، بزووتنەوەكەمان توركیا لە سۆسیالیزم نزیك دەكاتەوە.

**میهری بەللی:** بەڵێ ئەوەی وتبووی پوچە، چۆن ئەوان شۆڕشی نیشتمانی دیموكراتی دەكەن و تۆش دێیت و دەڵێیت، خۆت لابدە سەرەی منە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بۆ ئەوەی من شۆڕشی سۆسیالیستی بكەم، ئەم هەڤاڵەمان خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ، ئەوەی شۆڕشێكی نیشتمانی دیموكراتی پێك بهێنێت دەتوانێت شۆڕشێكی سۆسیالیستی رابپەڕێنێت.

**میهری بەللی:** بەڵێ.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بێگومان.

**میهری بەللی:** تۆ كێیت تا كلیلی هەموو شتێكت پێ بسپێرێ.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** باوەڕدەكەم كە چۆن ئێوە ئەم وشیاربوونە كوردیەتان ژیان كرد، هەروەها ماناو بەهای سەركەوتنمان لە دەربازكردنی چواردە ساڵەی رابردوو لەناو گەرمایی شەڕێكی توندوتیژدا و نیشاندانی توانا و چالاكیەكی ئەوەندە مەزن دەبینن.

**میهری بەللی:** بەڵێ.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەم كارە بەو مانایە نایەت كە ئێمە توركیامان ناچاری وەرچەرخانێكی مەزن كرد..؟

**میهری بەللی:** زۆر سروشتیە..

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەمە روون و ئاشكرایە.

**میهری بەللی:** بۆنمونە هەڵسانمان بەیەکەوە بەشرۆڤەکردنی رەوشەکە بەرهەمێکی سروشتی ئەم تێکۆشانەیە.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** ئەم هەڵوێستە بۆ من وەك هەڵوێستێکی سروشتی و بەهادارە. گفتوگۆ کردنی رەوشی تورکیا بەشێوەیەکی توند گرێدراوی ئەم شەڕە شۆڕشگێڕییەیە، وا نییە..؟ وەك تێبینی دەکەن تەنانەت پارتیەکانی رژێم گفتوگۆی خۆیان پەیوەست بەم شەڕەوە دەکەن، بەڵام بەداخێکی زۆرەوە هەندێك گروپ، نازانم ناوی چەپی لێبکەم؟

**میهری بەللی:** هەندێ گروپی چەپ.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** کە بەناو خۆیدا چۆتەوە و لەپارتە بۆرژوازیەکانیش دواکەوتووترە.

**میهری بەللی:** تەنانەت یەك وشەش ناڵێن وەك پرسێکی بەو رەنگە بوونی نییە.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** هیچ ناڵێن. زۆر سەرسووڕهێنەرە، وا نییە..؟

**میهری بەللی:** چەپن، یەك وشە لەسەر پرسی یەکەمی وڵات ناڵێن، چاوی خۆیان دەگرن بۆ بەرژەوەندی هەندێ لایەنی تر.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** ئەوە ئەو هۆکارە سەرەکییە نییە کە پێش ناکەوێ؟

**میهری بەللی:** ئەگەر دەخوازن با هەندێك لەسەر ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی لە تورکیادا راوەستین.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** باشترە کە تێروانینی خۆتان لەسەری بدەن، موخاتەب کێیە؟ دوای ئەوەش ئەگەر پێویست بوو لەسەری ئەدوێم.

**میهری بەللی:** بەڕای من موخاتەب و ئۆپۆزیسیۆن نا.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** ئۆپۆزیسیۆن و مەخاتەب، چۆن دەخوازی چارەسەری بکە.

**میهری بەللی:** وەك دەزانرێت ئەمڕۆ لە تورکیادا چەپێك هەیە کە هزری سۆسیالیستی پەسندکردووە، ئەوە بەو مانایە دێت کاتێك دەڵێین: چەپ، لەلای ئەوەوە ئۆپۆزیسیۆنی کوردی هەیە. مەبەستمان لەوەیە کە پارتی گەلی دیموکراسی HADEP لە گۆڕەپانی ئاشکرادا نوێنەرایەتی دەکات.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** باشە..

**میهری بەللی:** رێم بدە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەم خاڵە بکەم: ئەو گروپانەی ناوی "چەپی پەرلەمانی" لەخۆیان دەکەن، لە راستیدا ئەوانە تەنها پارتی رژێمن. دروشمی چەپیان لەکاتی ئەنجامدانی رۆڵی ئۆپۆزیسیۆن بەرزکردەوە، بەڵام بەشێوەیەکی دیماگۆجی بوو، پارتی رەفا لەم بوارەدا لەسەرووی ئەو پارتیانەیە کە بەم شێوازە پلەی بەدەست هێناوە، ئەمە راستیەکە و پێویستە

ببینرێت، واتە پارتی رەفا بۆ ماوەیەکی درێژ خۆی وانیشاندا کە ئۆپۆزیسیۆنی یەکەمە و هێزی خۆی بەرێژەی یەکەم لەم خاڵەدا بەدەست هێنا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** دەتەوێ بڵێی زاراوەی چەپەکانی بەکارهێنا.

**میهری بەللی:** بەکاری هێنا و بەمەش سۆزی نیشتمانی گەلی بزواند، ئەمەش گرنگە، ساڵی پار لە رێگەی شێوازی دەسەڵاتیەوە دیار بوو کە چەندە پارتیەکی پوچە، ئەوە زۆر بەڕوونی دەرکەوت، بۆ ئەوەش ناوی چەپی لێناکەن، بەڵکو ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتیە لە راستی تورکیادا، لە راستیدا ئەم رەوشە گوزارشت لە رەوشی پارچە بوون دەکات لە گۆڕەپانی ئاشکرا و شاراوەدا. وەك هەوڵی بەلارێدابردنە و بەناوی چەپەوە بەرێوەدەبرێ و بەشێوەیەکی نەخشە بۆکێشراو. بۆنمونە بڕوانە پارتی دۆغو پەرینچەك، پارێزەرێکی سەرسەختە لە سیاسەتی فەرمی لەژێر ناوی چەپدا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** رێگرێگە لە رێگەی یەکێتیدا.

**میهری بەللی:** ناوی بەرخۆدانی نیشتمانی دیموکراسی کوردی لەکەدار دەکات و لەهەمانکاتدا وەك دوژمنایەتی لەگەڵ ئیمپریالیزم خۆی نیشاندەدات.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لەلایەکی دیکەشەوە یارمەتی دەداتە بارزانی.

**میهری بەللی:** یارمەتی بارزانی دەدات و بەمەش پشتگیری ئەو هەوڵانە دەکات کە دەیانەوێت بزووتنەوەی نیشتمانی دیموکراسی کوردی پاکتاو بکەن، ئەمە بەرچاوترین سیمای ئەم پارتیەیە کە بانگەشە دەکات پارتیەکی ماویستە، بەڵام ئێمە ناوی ماوییەکی میلیتاریستی لێدەکەین کە لە زانکۆ رۆژئاواییەکانەوە بۆمان هاتووە نەك لە چین و ئەشکەوتەکانی ینان (ئەشکەوتی بەناوبانگن لە تورکیا) لەبەرئەوە ناوی "خەڵکی ئەشکەوتی ینان"مان لێکردن، ئەمەش گرنگترین سیمای خەڵکی ئەشکەوتی ینانە: دوژمنایەتی کردنی دوژمنی سەرەکی دەوڵەت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەم شێوەیە لەگەڵ دەوڵەت یەکانگیر بوو.

**میهری بەللی:** بەمەش دوژمنی خۆی دیاری کرد، دوژمنی ژمارەیەك لەژێر ناوی بانگەشە و بیانویەك کە زۆر شۆڕشگێڕانە خۆی نیشاندەدات و دژایەتی ئیمپریالیزم دەکات.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** هەروەها خۆی وەك ستالینیستێکی سەرسەخت نیشان دەدات، ئەویش بە هەڵوێستێکی ماویستانە لە رێگەی بە ئامانجگرتنی ئەو ئامانجانەی کە دەوڵەت لەبەردەم خۆی دایدەنێت. تۆ ئەم مەسەلەیەت باشتر شی بکردایەتەوە.

**میهری بەللی:** لەساڵی 1970 واتە لەسەرەتای شەڕی سارد بۆ نمونە یەکێتی سۆڤیەت دوژمنی یەکەمی دەوڵەت بوو، دوژمنی یەکەمی پارتی

پەرینچەکیش هەمان یەکێتی سۆڤیەت بوو، بەڵام دوای تاوانبارکردنی بەخیانەتکردن لە سۆسیالیزم بە لۆژیکێکی چەپی سەراوژێر، لەکاتێکدا دوژمنی ئەمریکی جێگەی دووەمی گرتبوو، بەشێوەیەکی زۆر گەرم پارێزگاری لەناتۆ دەکرد کە دەتوانین ناوی چەپی ناتۆی لێبکەین، دوژمنی یەکەمین دەوڵەت کێیە، بەتایبەت بەهاتنی هەشتاکان و نەوەدەکان؟

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** ئەوە PKKیە، ئەم جارە هێرشی PKKی کرد.

**میهری بەللی:** ئەوە PKKیە ناوزەدی کرد بە "ماشەی خوێناوی ئیمپریالیزم".

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** ئەمە لەکاتێکدا کە ئێمە بەو پارتیە دادەنرێین توندوتیژترین شەڕ لەبەرامبەر ئیمپریالیزم بەتایبەت ئەمریکا بەڕێوە دەبەین.

**میهری بەللی:** بەتەواوی پێویست ناکات باس لەوە بکەین، بەڵام بۆچی و ئەو هۆکارانە چین؟ بێگومان ئەم پارتیە ناچار نییە هێرشە نەزۆکەکانی کۆنتڕ گەریلا بێ هۆ دووبارە بکاتەوە، زۆر سروشتیە کە خۆی وەك دوژمنێکی ئیمپریالیزم نیشانبدات و کراسێکی شۆڕشگێڕیانە لەبەربکات، لەکاتێکدا ئەوانی تر تاوانبار دەکات و بەزەلکاوی ئیمپریالیزم ناوزەدیان دەکات.

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** ئەتەوێ بڵێیت: دەتوانین بەڕەوتی چەپی دەوڵەت دایبنێین.

**میهری بەللی:** من پارتی پەرینچەك لەگەڵ چەپی تورکدا ریزناکەم، بەڵکو قەوارەیەکی دەرەکی دزێوە کە دەستکردی دەوڵەتە.

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** باشە.

**میهری بەللی:** لەوانە زیاتر تاوانباری ترسناکتر هەیە لەوانە: بزووتنەوەی کوردان بەتەواوی نەتەوەییە و، مۆرکێکی نیشتمانی رزگاری پێوەیە، لە کاتێکدا ئێمە سۆسیالیستین و لە پێناوی ئامانجی بەشکۆدا تێدەکۆشین، بۆ ئەوە پێویستە مەودا لەنێوانماندا هەبێت.

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** کێ ئەوە دەڵێت...؟

**میهری بەللی:** بەتەواوی بەو وشانە نا، بەڵکو...

**عەبدوللا نۆچ ئالان:** لەو دەچێت.

**میهری بەللی:** بەتەواوی بەو وشانە نییە... بەڵکو بەهەڵسەنگاندنەکە دەگاتە ئەو رێژەیە، واتە بچووك کردن و بێ واتاکردنی بزووتنەوەی کوردی لە رێگەی تەواو بە ناسیۆنالیزم لەقەڵەمدانی، بێگومان پێویستە ئەم بزووتنەوەیە بە شۆڕشی سۆسیالیستی تەواو بەرەو سەرکەوتن ببرێت، ئەمەش کاری ئێمەیە، دەمەوێت ئاماژە بەوە بکەم کە هەندێکیان بەو وشانە

موخاتەبەیان کردم، من ناچار نییم بڵێم: فلان کەس و فلان رێکخستن ئەوەیان ووت. ئەوەی لێرەدا گرنگە هەڵوێست لە بەرخۆدانی نیشتمانی دیموکراسی کوردستان هەڵوێستێکی ئیستهلاکی ـ بازاڕییە. لێرەدا بەهای ئەو دیموکراسی و شۆڕشگێڕییە لە راستی تورکیادا دیاردەبێت، ئەگەر هەڵوێستی تۆ نێگەتیف بێت، هەرچیەکی لە رادەبەدەرت کردبێ، ناکرێت تۆ بەدیموکرات و چەپ دابنرێیت. دیموکراسیەت مانای چییە..؟ بەبێ جێگەگرتنی گەلێك لەسەر شانۆی سیاسی بەناسنامەی تایبەتی خۆی دەکرێت باس لە گۆڕانێکی دیموکراسی بکەین؟ بێگومان نا...

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** وەکو ئەوانە ناتوانن لەگەڵ گەلەکەیاندا دیموکرات بن.

**میهری بەللی:** بەتەواوی ئەمەوێت ئەوە بڵێم، ئەمە هەڵوێستێکی ئیستهلاکییە، ئەگەر هەڵوێستی تۆ دروست بێ پێویستە هەڵوێستی هاوکاری و پشتگیری یەکێتی ئارەزوومەندانەی هەردوو گەلان لەسەر بنەمای یەکسانی بپارێزیت، من پشتگیری ژیانی هاوبەشی هەردوو گەل دەکەم لە وڵاتێکی هاوبەشدا و لەگەڵ ژیانی جیاوازدا نییم. بێگومان پێکهێنانی ئەم یەکێتییە ناتوانرێ ئەنجام بدرێت تەنها لەژێر سایەی دیموکراسیەت نەبێ، هەوڵە فاشیەکان تەنیا پارچەکردنی وڵاتیان لێدەکەوێتەوە، تێکۆشانی ئێمە تێکۆشانێکە لە پێناوی وڵاتێکی هاوبەش لەژێر سێبەری یەکێتیەکی ئارەزوومەندانە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئێمە ناوی "یەکێتی لەسەر بنەمای ئازادی و یەکسانی" لێدەکەین.

**میهری بەللی:** یەکێتی، راستە یەکێتی ئارەزوومەندانە. لێرەدا پێویستە بووترێ: چەپی تورك، چەپی کۆمەڵایەتی تورکی.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** دەکرێت چەپی تورکی سەرلەنوێ وشیار بێتەوە؟ چی پێشنیار دەکەن بۆ چەپی تورکی.

**میهری بەللی:** لێرەدا دەمەوێت بڵێم کە...

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** پێویستە چۆن موخاتەبێ ئامادە بکەین؟

**میهری بەللی:** من باوەڕی تەواوم هەیە کە پێکهێنانی کار لەژێر ناو و رێکخستنی جیاوازدا و سەپاندنی ئەم یان ئەو تێڕوانین بەسەر رێکخستنەکان و کارکردن بۆ بەدەستهێنانی ئەنجام بەم شێوازە ئامانجی یەکێتی دەگاتە خەیاڵێکی دابڕاو و پێك نایەت.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لەبواری تاکتیکەوە هەڵوێستێکی زۆر هەڵەیە.

**میهری بەللی:** هەڵەیە.... پارچەبوون راستیەکی زیندووە، بەو شێوەیە ئامانجی ئێمە لە چەپێکی بەم شێوەیە بڵاودا پێویستە یەکێتی و کاری بەکۆردینە بێت، ئەم ئەرکەش بەزۆر خۆی دەسەپێنێ.

**عەبدوڵڵا نۆج نالان:** ئەخوازی بڵێیت ئامانجی یەکەم کۆردیناسیۆنە.

**میهری بەللی:** بەڵکو ئامانجی سەرەکی کاری بەکۆردینەیە لەنێوان رێکخستنە جیاوازەکان و، ئاواکردنی کۆمیتەیەکی کۆردینەی هاوبەشی چالاك، لەساکارترین نمونە بڕوانە. کاتێك لە بۆنەیەکدا رێپێوانێکی ئاشتیانە رێکدەخرێت، هەر پارتیەك خۆی بەتەنیا نیشاندەدات، ئەنجام سەرکەوتنێکی تەم و مژاوییە، پارتی گەلی دیموکراسی و پارتی ئازادی و دیموکراسی بەیەکەوە ئاهەنگێك سازدەکەن و تیایدا دروشمی شۆڕشگێڕی بەرزدەکەنەوە و داوای ئاشتی دەکەن، دەڵێن: "با خوێن رژاندن بوەستێت" بەدەیان هەزارکەس کۆدەبێتەوە، هەروەها رێپێوانێکیان لە ئەنقەرە لەمێژووی 12 ـ 13ی نیسان رێکخست.

**عەبدوڵڵا نۆج نالان:** چی روویدا..

**میهری بەللی:** رێپێوانێك بوو کە دروشم لەدژی چەتەکانی نێودەوڵەت و شەڕی قڕێژ تیایدا بەرزکرابۆوە، زۆر سەرکەوتوو بوو، لەسەر ئاستی ئەنقەرە پارتیەکانی رژێم ناتوانن وەك ئەمە رێکی بخەن، بەڵام ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی بەسەرکەوتوویی ئەنجامی دەدات هەرچەندە بەشێکی بەشداری دەکات، کێ دەزانێ چی روودەدات کاتێك هەموو ئۆپۆزیسیۆن کۆببێتەوە؟

**عەبدوڵڵا نۆج نالان:** رێپێوانێکی زۆر بەرفراوان، لەوانە بڵندتر بوو کە لەحەفتاکاندا ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی پێی هەڵدەستا، وا نییە...؟

**میهری بەللی:** بەڵێ بەزۆریش دەربازی ئەکرد، لەگەڵ یەك جیاوازیدا رێپێوانەکانی ئەمڕۆ لاوان و بەساڵاچووەکان بەشداری تێدا دەکەن، لەکاتێکدا لە حەفتاکاندا تەنها لاو بوون.

**عەبدوڵڵا نۆج نالان:** لەوکاتەدا لاوان بەتەنیا بوون، ئەمڕۆ گەل هەموو بەیەکەوە.

**میهری بەللی:** بەڵێ ئەمڕۆ هەموو گەل.

**عەبدوڵڵا نۆج نالان:** لاوانی ئەمڕۆ لاوازن، سەرنجی تۆ راناکێشێ؟ لەئەنجامدا پیر و پەککەوتەکان دەکەونە ریزەکانی پێشەوە.

**میهری بەللی:** بەڵێ پێویستە ئەو وزە مەزنەی لاوەکان کە لەو کاتانەدا هەبوو لەبیرنەکەین.

**عەبدوڵڵا نۆج نالان:** بەڵام ئەمڕۆ بە پلەی دووەم دێت.

**میهری بەللی:** ئێستا لەپلەی دووەمدایە. بەڵێ.

**عەبدوڵلا نۆج ئالان:** بەڕاستی سەرسوورهێنەرە.

**میهری بەللی:** ئەو رێپێوانە هەیە کە لەگۆڕەپانی سوولتان ئەحمەد پێکهات و بەئەندازەی ئەو رێپێوانەیە کە باسمان لێوەکرد، مەبەستم ئەو رێپێوانەیە کە کەسایەتیە ئاینیەکان پێی هەستان بۆ ناڕەزایی لەبەرامبەر پەروەردەی عیلمانی.

**عەبدوڵلا نۆج ئالان:** هەروەها ئەویش.

**میهری بەللی:** ئەویش رێپێوانێکی گەورە بوو لەکاتێکدا ئەو رێپێوانەی کە پارتییەکانی دیکە پێی هەڵدەستن خاو و بێ رەنگە. ئەوە ئاماژە بۆچی دەکات؟ ئەوە ئاماژەیە بۆ ناڕاستی ئەم جیاوازییەی کە لەژێر ناوی بەرەی عیلمانیەت و بەرەی ئایینیدا هەبوو.

**عەبدوڵلا نۆج ئالان:** زۆر سروشتییە.

**میهری بەللی:** راستی کار ئەمەیە کە ئەو ئۆپۆزیسیۆنێکی کۆمەڵایەتی ئایینی بێت، یان عیلمانی.

**عەبدوڵلا نۆج ئالان:** دەمەوێت سەرنجتان بۆ مەرزبەندی ئۆپۆزیسیۆن رابکێشم کە لەژێر ناوی عیلمانی دایە و ناعیلمانی مەرزبەندییەکی ناڕێك و چەواشەیە.

**میهری بەللی:** بەڵێ، ئۆپۆزیسیۆنێکی چەواشەیە، ئامانج لێی ئاراستەکردنیەتی بۆ رێڕەوێکی تر.

**عەبدوڵلا نۆج ئالان:** درێژە بەشیکردنەوە بدە...

**میهری بەللی:** وەك تێبینیتان کرد ئۆپۆزیسیۆنی عیلمانی و پێکهێنانی بەرەی عیلمانی دوای رووداوی سوسورلوك بوو، پرۆسەی کوژاندنەوەی رووناکی کە بە ملیۆنان بەشداریان تیایدا کرد و رووداوێکی گرنگ و جوان بوو لەم چوارچێوەیەدا بوو.

**عەبدوڵلا نۆج ئالان:** لەیاد نەکە، ئەوەش ناڕەزاییە بۆ ئەو شەڕە قرێژە.

**میهری بەللی:** دروشمی دژی شەڕی قرێژ دەووترایەوە، دروشمێك کە کۆمەڵگای خاوێنی دەوێت، بینیان بەرەو خراپی دەچێت، لەدواییدا ئاراستەیان کرد و دروشمی عیلمانیەتیان پێش خست.

**عەبدوڵلا نۆج ئالان:** بەلاڕێدا بردیان.

**میهری بەللی:** بەلاڕێدا بردیان، پێویستە تەڵەی عیلمانیەت باش بناسرێت.

**عەبدوڵلا نۆج ئالان:** وەکو ـ سەرنجتان رادەکێشم ـ وەکو بزووتنەوەی کارە ئۆغلان بوو.

**میهری بەللی:** بەڵێ ـ بەڵێ.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** بینای مەزنی چەپ، لەژێر دروشمی عیلمانیەت دا بەلارێدا بردنیان پێویستە بەکاری بهێنین. راستە.

**میهری بەللی:** ئێستا لەم رەوشەدا، لەپێشماندا ئامانجی دیار هەیە. ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی وەکو کۆردینەیەك جوڵەی کرد؟ بە سەدهەزاران بخەینە ناو جوڵە، ملیۆنان بخەینە ناو جوڵە.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** راستە.

**میهری بەللی:** ئەمە راستە، ئەگەر ئێمە نەیکەین، لەپێشماندا هەڵبژاردن هەیە، لەهەڵبژاردندا HADEP و ODP و پارتی رەنج و SIP رێکخستنی ئاشکرا و نا ئاشکرا و دەزگا دیموکراسیەکان، ئەگەر یەکتری بگرن و لەژێر چەتری کۆردینەیەك بەشداری هەڵبژاردن بین، ئەوکاتە دەبینە ئۆپۆزیسیۆنی ناوەندی، وەکو ئێمە ئاستی هەڵبژاردنمان دەرباز کردبێت، ئەو کاتە دەبینە دەسەڵات. ئەمە راستیەکە، لەڕاستی تورکیادا ئەم کارە هاتە ئێرە، چۆن هاتە ئێرە؟ بێگومان گرێدراوی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردانە...

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** جێگەیەکی دیاریکەری هەیە.

**میهری بەللی:** دەبێ بزانین، بوونی سەرۆکایەتیەك لەسەر ئەم بزووتنەوەیە کە فیکر و رێنمایی چالاکی هاوچەرخانەیە، ئەمە بۆ تورکیا شانسێکی مەزنە.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** شانسە.

**میهری بەللی:** شانسێکی مەزنە و، ئەم شانسەش وەکو فەرزێك دەبینین، ئەمە ئەرکی سۆسیالیستانی تورکیایە، کارێکی بەپەلەی چەپە، پێویستە لەنێوان باڵەکانی ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی کۆردینەیەك پێك بهێنین و بکەوێتە پراکتیك. دروشمەکان دیارن، سەربەخۆیی و دیموکراسیەتی راست ئامانجە، ئەوەی تا ئێستا بەناوی دیموکراسی پێشکەشیان دەکردین بێگومان ئەوە ناڵێم.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** دەکرێت لەپەیوەندی کورد ـ تورکدا پەیوەندی پێك بێت؟

**میهری بەللی:** بەواتای هەموو هێزە نەتەوەییە دیموکراسیەکان، لەبواری سیاسیدا لەسەر هێڵی چینایەتیان خۆیان رێك بخەن و، بەناسنامەی خۆیان بکەونە جوڵە، ئەمەیە دیموکراسی.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** بۆ کوردەکانیش وەها بوو؟

**میهری بەللی:** ئەمە ئامانج بوو.

**عەبدوڵڵا نۆج ئالان:** بۆ کوردەکانیش وەها بوو؟

**میهری بەللی:** بۆ کوردان و تورکەکان بەیەکەوە.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** بۆ داوای نیشتمانی دیموکراسی.

**میهری بەللی:** بەناسنامەی خۆیان ئەمە مانای چییە؟ بەناسنامەی خۆیان مانایەکی تری هەیە؟ ئەمە ئامانجێکی دیموکراسیە، بەمانای نانێك نایەت کە بچووك دەبێتەوە، بەڵکو ژیانێکی مرۆڤانەی بەرێز و ئامانجێکی مەزن و بەرفراوانی دەبێت. ئەمەویت ئەمە بڵێم.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** هەندێك دەنگ لە سوپاش دەردەکەون، پێویستە ئەویش بەکارێکی پۆزەتیف دابنرێت.

**میهری بەللی:** بێگومان پێویستە بزانین کە بڵندبوونەوەی هەندێك دەنگی نیشتمانی لەنێو ریزەکانی سوپادا و خولانەوەی ئۆپۆزیسیۆنی گەلێری لەبازنەیەکدا و ژیانکردنی لەنێو رەوشێکی پارچەدا، ئەمانە دەرئەنجامە بەدەستهاتووەکان پێش ناخەن. ئەوانەی ئەرکی پاراستنی....

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** واتە ئەو پتەو دەبێ بەرێژەی پتەوبوونی ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی.

**میهری بەللی:** ئەنجامێکی تێر و تەسەل بەدەست دێت لەپێناوی پێکهێنانی ئاشتی و دیموکراسیەت.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** دەستە فاشیەکان لە رەوشی بڵاوبوونەوەدان و؛ دەستە شۆڕشگێڕی و نیشتمانیە دیموکراسیەکان لە رەوشی پێشکەوتندان؟

**میهری بەللی:** پێویستە لەبیر نەکەین کە دوژمن بێ ئاگا نییە و ئەمریکا بەهەموو تواناکان پشتگیری دەکات.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** چاوەڕوان دەکەیت لەرۆژانی داهاتوودا چی روو‌بدات.

**میهری بەللی:** ئێستا لە گۆڕەپانەکەدا پارتییەك نییە بەشێوازی پارتی رەفا کار بکات.

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان:** باشە.

**میهری بەللی:** ئەوانە بەرێژەیەکی زۆر بە رێکخستن و کۆردینە کار دەکەن، هەل و پلەی سەرکەوتنمان چەندە؟ پارتی رەفا لە پارتیەکی بچوکەوە هەنگاوی نا بۆ گەورەترین پارتی لەرێی ئەو دروشمە چەپانەی کە بەکاری هێنا 5٪ی دەنگەکانی کە بەدەستی هێنابوو لە دەوروبەرە ئایینیەکان و ئەوانەی تریش، لەراستیدا دەنگی ئێمە بوون، هەستی نیشتمانی گەلی موخاتەبە کرد و هەروەها رۆحی دژایەتیکردنی ئیمپریالیزم لەلای گەل و هەستی دژایەتیکردنی سەهیۆنیزم لەلایەن گەلە ئیسلامیە دراوسێیەکان و هەروەها رۆحی هاوکاری ئەوانی بەبناخە گرت. بەرەوی بە هێزی خۆی دا بەلام ئەمرۆ تەنیا دوای تێپەربوونی ساڵێك بەسەر دەسەلات و مۆرکردنی پەیمانێك لەگەڵ ئیسرائیلدا پەردەی لەروو هەڵماڵدرا.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** یەکلایی بۆوە کە دژایەتیکردنی بۆ سەهیۆنیزم تەنیا قسەیە.

**میهری بەللی:** لە ئێستا بەدواوە ناتوانێت لەبەردەمی گەل وەك دوژمنێکی سەهیۆنیزم خۆی نیشان بدات، هەروەها ناتوانێت خۆی وەکو ئەوە نیشان بدات کە پێشەنگایەتی سەرهەڵدان دەکات، ئەگەر وایکرد زۆر ئاسانە ریسوا بکرێت و راستی نیشان بدرێت، بەڵام ئێمە کاتێك چووینە لای جەماوەر و پارێزگاریمان لە پرسی دژایەتیکردنی ئیمپریالیزم و هەروەها پاراستنی سەربەخۆیی و دیموکراسی کرد، ئێمە راستگۆیی خۆمان بەژیانی خۆمان نیشاندا و لەگەڵ گەلی فەلەستیندا بەخوێنی خۆمان بەشداریمان لە تێکۆشان کرد دژی سەهیۆنیزم. یەك مرۆڤی ئایینی هەیە چوبێت و شەڕی سەهیۆنیزمی کردبێت؟ ئێمە باوەڕیمان زیاتر داوە، بەڵام ئەوانی دیکە لەناوخۆدا پووچن و، لەئێستا بەدواوە ناتوانن تێکۆشانی گەلی فەلەستینی و شەڕی نیشتمانی دیموکراسی بۆخۆیان بگۆڕن بە رەنجێکی درۆزنانە و بانگەشەی شەڕێکی ئایینی بکەن، چونکە ئەم بانگەشانە خزمەتی شەڕەکەیان ناکات. بەتایبەت ئەوە شەڕێکە کە حەفتا ساڵ بەردەوامە و عەرەبە مەسیحیەکانیش تیایدا شەهید بوون، نیشاندانی ئەو تێکۆشانە وەکو تێکۆشانێکی موسڵمانانە هەوڵێکی بێ هودە و بێ مانایە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەوانەی کە داوای ئاشتی دەکەن لەناو ئیسرائیلیەکاندا.

**میهری بەللی:** ئەوانی تریش لەگەڵ گرانی بارودۆخەکە لەسەر تێکۆشان بەردەوامن.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بۆ نمونە ئیسحاق رابین یان کوشت چونکە داوای ئاشتی کرد.

**میهری بەللی:** بەڵێ ئەو باوەڕی دەکرد وەك رەوشی ئەوانی تریش.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** واتە ئەو شێوازێکی درەنگە و پشتگیرییەکی ساختەیە.

**میهری بەللی:** ئێمە لەم پێناوەدا شەهیدمان دا، لەکاتێکدا ئەوان خەریك بوون بە خۆنیشاندان و ئالا سەوزەکانیان بڵند کردبۆوە و بەردیان دەهاوێشت و دەکەوتنە سەر زەوی وەك بڵێی فیشەکێکیان لێ کەوتبێ، دروشمی "لا الە الا اللە"یان دووبارە دەکردەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەوە تەنها خۆنیشاندان بوو.

**میهری بەللی:** شەهیدبوون بەم رەنگە نابێت، شەهیدبوون ئەوەیە کە سینگت بکەیتەوە لەبەرامبەر فیشەك، بەڵام بۆ سۆسیالیزمی دیموکراسی ئەوا ئەوان بارووودی خۆیان وونکردووە، لە شەستەکاندا ئەجەوید ئەلتەرناتیفێکی راستی پێشکەشی ئێمە کرد لەژێر ناوی سۆسیالیزمی دیموکراتدا، بەڵام ئەمرۆ

بەباشی بەرەو راست چووە و، لەیەك ریزدایە لەگەڵ تورکێش. بۆ ماوەی چواردە ساڵە کوالیسیۆنێکی بەناوبانگیان هەیە لەگەڵ ئینۆنو و قەرەیاڵچین و چیللەر.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەو گەورەترین هاندەرە بۆ شەڕی تایبەت.

**میهری بەللی:** پێی دەوترێت ئەوانەی خاوەنی جێگەیەکن، لەو ماوەیەی ستەمی فاشی گەیشتۆتە لوتکە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** هەموویان لە کوالیسیۆنی فاشیدا کۆدەبنەوە.

**میهری بەللی:** هەموویان بەشدارن تیایدا بەچیلەریشەوە، جیاوازی چییە لەنێوان قەرەیاڵچین و چیللەر، چ جیاوازیەکی لەگەڵ ئینۆنو هەیە. ئیتر ناتوانن بەوتەی دیموکراسیەت و شتی تریش گەل هەڵبخەڵەتێنن. لەم بوارەدا ئێمە لەوان بەهێزترین و زیاتر جێگەی باوەڕین و سەرکەوتووین.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەمە راستە.

**میهری بەللی:** راستی قسەکانمان بەتێکۆشانمان پێکهێنا، بۆ ئەوەش ئایندە بۆ ئێمەیە. بەتەنیا دەست لەناو دەستدا بجووڵێنەوە و بەکۆردینەیەکی پتەو خەبات بکەین.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەگەر دەخوازن با هەندێك لەسەر پرسەکە بدوێم، لە راستیدا دەتوانین بڵێین کە ئێمە رەوشی ئێستای تورکیا و قۆناخی نوێمان بەهێڵە گشتیەکانیەوە هەڵسەنگاند. ئەو ئۆپۆزیسیۆنەی ئێستا لە بزووتنەوەی خوێندکارانی ساڵی 1970 لە پێشترە و سەرتاسەری تر و، قووڵترە و بەرەو ئەوە دەچێ کە لاوان بکەونە پلەی دووەم، پێویستە لەم لایەنەوە ببینین، ئەمە یەکەم بوو، دووەم ئیدی کارە ئۆغلان ناتوانێت وەك ساڵانی حەفتاکانی بزووتنەوەی خۆی بسەپێنێت، هەرەچەندە سەرۆکی CHP بایقاڵ دەخوازێت ئەو وزەیەی لە دروشمی عیلمانیەت دەردەکەوێت کۆنترۆڵ بکات و جارێکی دیکە بەلارێیدا ببات، باوەڕناکەم سەرکەوتن بەدەست بهێنێت دوای ئەوەی بەشداریان لەگەڵ چیللەر کرد لە دەستەی فاشیەکان بۆ ماوەی 5 ساڵ لەسەردەمی حکومەتی قەرەیاڵچیندا. گەلەکەمان زیاد لەپێویست راستی ئەوانە دەزانێت، تەنیا پێویستە ئێمە ئەرکەکانمان پێك بێنین، بەشێوەیەکی تایبەت کۆالیسیۆنەکەمان.

**میهری بەللی:** رێم بدە بەکورتی پیلانەکانی پارتی گەلی کۆماری CHP شیبکەمەوە، ئەمڕۆ زۆر بەپەلە هەوڵدان هەیە بۆ دامەزراندنی یەکێتیەکی هەڵبژاردن لەنێوان پارتی گەلی کۆماری و پارتیODP، لەپشت پەردەوە ئەرکە پەرلەمانیەکان نیشانی کەسایەتیەکان دەدەن، هەندێك خێرخواز لە رۆژنامەی "جمهوریەت" وتار بڵاودەکەنەوە و دەڵێن: زیانی بەشداری

سۆسیالیستەکانی پارتیODP لە پەرلەماندا چییە؟ جیاوازی ئەم سازشانە و ئەوانەی لەدوای 12ی ئەیلول دروست بوون چییە؟ گەڕان بەدوای دۆزینەوەی توانای کار لەژێر چەتری پارتی سۆسیالیستی دیموکراسی SODEP ئەمە شتێکە و، هەڵسانی پارتی گەلی کۆماری بە یەکخستنی ریزەکانی لەگەڵ فاشیستەکان دوای ئەوەی کە بینی هەڵخەڵەتاوە و بەتایبەت، دوای بینینی هەڵسوکەوتی ئەوەی پێی دەووترێت رەوتی سۆسیال دیموکرات ئەمەیان شتێکی ترە ئەمەی دوایی...

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** ئەمە خۆکوشتنە.

**میهری بەللی:** خۆکوشتنێکی سیاسی و خیانەتە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ناڵان:** لەگەڵ بۆچوونەکەت دام، هەوڵدانی پارتی گەلی کۆماری بۆ بەلارێدابردنی وزە بەدەست هاتووەکان لەژێر ناوی عیلمانیەت، راستیەکی جێگیرە و بێشەرمانەیە، پێویستە دەرفەتیان نەدەین و ئەمەش ئەرکێکی بەپەلەیە و لەسەر هەموو گروپەکان، لەسەرووی هەموویانەوە چەپەکان و سۆسیالیستەکان، هیوادارم ئەم ئەرکەیان لەبیر نەکەن. سروشتی پەیوەندی لەگەڵ پارتی گەلی کۆماری پێویستە چۆن بێت؟ پرسیارێکە شایەنی وەڵامە، بەڵام رێم بدە لەسەرەتادا ئاماژە بە بەشداری دەستە فاشیە خوێنرێژەکان بکەم لەشەڕی تایبەت بەدرێژایی 15 ساڵی رابردوو. پێویستە ئەم راستیە ببینرێت و لەبەر ئەو رۆشناییەدا ئەگەر پێویست بێت پارتی گەلی کۆماری لە ئاییندەدا هەڵبسەنگێنرێت، ئەم پارتیە هەڵوێستی خۆی دیاری دەکات؟ لەمەش زیاتر نەك هەڵەی خۆی بەڵکو خیانەت دەبینێ، دەنیز بایکاڵ لە رەگ و ریشەوە دژی ئەم پرسەیە؟ پێویستە ئەم هەڵوێستانە گفتوگۆ بکرێن.

لەگەڵ ئەوانەدا وەك ئاماژەمان پێکرد پارتی رەفا هێزێکی زۆری کۆکردەوە لە رێگەی لەخۆگرتنی ووتە و دروشمە چەپەکان و، دەستی گرت بەسەر ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتیدا. کەوتنی دەمامکی بانگەشەی درۆزنانەی دژایەتی کردنی ئیمپریالیزم و سەهیۆنیزم شتێکی باش بوو، دەرکەوت کە شتێك ناداتە هەژارەکان و، رەفا تەنیا یەکێك لە بازرگانە گەورەکانی شەڕە، بەمەش رۆڵێکی پۆزەتیف دیاری دەکرێت لە رێبازی ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی و کەوتنەسەر ئاراستەی سروشتی خۆی. بەکورتی هیچ شتێك نەماوە کە ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی لەشێوازی رەفا و پارتی گەلی کۆماری بیڵێن، بۆرژوازیەت ئیتر وەك رابردوو ئاسان نییە کە بۆ درێژەدان بەتەمەنی خۆی ئەم دوو پارتیە بەکار بهێنێ.

بەڵام لەوانە هەمووی گرنگتر ئەو ناڕەزاییە کۆمەڵایەتییە گەورەیەبوو لە گۆڕینی کۆمەڵەکانی نوخبە بۆ چەتەکانی نێودەوڵەت، بەم واتایە دەتوانین بڵێین کۆمەڵگا بەتەواوی دژایەتی چەتە فاشیەکان دەکات، هۆکاری سەرەکی پێشنەکەوتنی دەستە فاشیەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی هەموو کۆمەڵگا لە رووی ئەو چەتانەی کە لەسەر دەستی دەوڵەت بەهێز دەبوون، بەڵام بەشێوەیەکی شاراوە و زۆر ترسناك، پرۆسەی کوژانەوەی روونـاکی و رێپێوانی ئاشتی بەشێوەیەکی بەرچاو دیاری دەکات کە کۆمەڵگا لە پێکهاتنی دەستە فاشیەکان زۆر بێزارە.

ئەمە ئەو قۆناخەیە کە کۆمەڵگا تیایدا دەژی، ئەمە بەڕاستی گرنگە. ئەگەر کۆمەڵگای تورکیا هەتا ئێستا نەیتوانیوە بگاتە رێکخستنێکی پێشڕەو و کۆردینەیەکی هاوبەش و یەکێتی هەموو رێکخستنە دیموکراسی و گەلێریەکان، بەڵام لە راستیدا ئەو لەناوەوە دەکوڵێت و بەتەواوی گۆڕاوە بۆ ئۆپۆزیسیۆنی دیموکراسی، کۆمەڵگای تورکی بۆ جاری یەکەمین لە مێژوودا دەردەکەوێت لەوەی ببێتە بناخە بۆ دەوڵەت، جا بەرچاو بێت یان بەرچاو نەبێت، دیار بێت یاخود شاراوە بێت و، ببێتە وزە بۆ ئۆپۆزیسیۆنی راستەقینە. لەگەڵ ئەوانەشدا ـــ ئەمەش زۆر گرنگە ـــ بۆرژوازیەت هەموو ئەو چەکانەی بەکارهێنا بۆ درێژەدان بەهەڵخەڵەتاندنی گەل، سیاسەتی نوخبەی فاشی و پێکهێنانی چەتەکانی دەوڵەت و بزووتنەوەی هێزی تایبەت و پارێزەرانی گوند ئیفلاسی کرد و کەوت، هەروەها سیاسەتی ئیسلامی نەرم و ئیسلامی رەفا بەتەواوی ئیفلاسی کرد، سەرباری ئەمەش ئەو سۆسیال دیموکراسیەی کە پارتی گەلی کۆماری بە ئەجەوید و ئەرداڵ و بایکاڵ پیادەی دەکات، بەتەواوی روونبۆتەوە کە چۆنە، واتە ئەم چەکانە کاریگەری خۆیان لەدەست داوە، لەگەڵ ئەوەی کە پارتی رێگای راست هەڵدەوەشێتەوە و کەوتۆتە نێو رەوشێك کە وەکو پارتیەکی راستڕەو ناتوانێ ریزە ناوخۆییەکانی کۆبکاتەوە.

لەسەرووی ئەمانەشەوە لەناو ریزەکانی سوپادا بێزاری زیاد دەکات لەبەرامبەر ئەو دەستە فاشیانەی کە بەدەست بڵاوبوونەوەوە دەناڵێنن، واتە وەکو رابوردوو باوەڕی بەسوپا ناهێنێ، سوپا دوای ئەو شەڕەی لە کوردستان بەڕێوەی برد، بەهەر شێوازێك بێت داوای چارەسەری دەکات، دەزانین کێ لەهەر کەس زیاتر داواکاری ئاشتیە؟ ئەو سەرباز و سەربازە پایە بەرزانەن کە لەکوردستان شەڕیان بەڕێوەبرد، کە زۆر لە رەوشی پورتوغال و فەرەنسا لە جەزائیر و روسیا لە ئەفغانستان و چەچەنستان دەچێت، دژایەتی کردنی سەربازەکان بۆ شەڕ و داواکردنی ئاشتی، ئەمە پێشکەوتنێکی نوێیە بۆ جاری یەکەمە لەناو ریزەکانی سوپای تورکیا دەردەکەوێت، ئەمە رەوشێکە شایەنی

بەدواداچوون و چاودێری کردنە لەلایەن ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی و کاتێك پێویست بێت پەیمانی لەگەڵدا ببەسترێت، بەڵام لەسەر بناخەی پشت بەستن بەهێزی خۆیی، رەوشی پێکهێنانی دەستەیەکی ئەلتەرناتیف لەنێو ریزەکانی سوپادا بە رەنگدانەوەیەکی پۆزەتیفانە دەرکەوتووە، لەکاتێکدا دەستەی فاشی بەرەو دواوە دەچێت و لاواز دەبێت، ئەمەش پێشکەوتنێکە شایەنی هەڵسەنگاندن و چارەسەرکردنە.

لەگەڵ ئەوانەدا هەروەها بڵاوبوونەوە کەوتۆتە ناو ریزەکانی هێزی ئاساییش، بەشێوەیەك لەدوای رووداوی "ئەلخلد" دەرکەوت کە هێزی کۆنی نەماوە، واتە حکومەت لەقۆناخێکی کاتیدا ژیان دەکات. لەگەڵ رای ئێوەدام کە ئەمریکا لە ئێستا بەدواوە هەوڵدەدات، ریزەکانی خۆی کۆبکاتەوە و لەپیاوەکانی خۆی بگەڕێت، زۆر زیاتر هەوڵبدات کە لەناو پارتیەکی ناوەندی راست کۆیانبکاتەوە و، جێ و دەسەڵاتی خۆی بەسەر حکومەتی ئێستادا بەکاربهێنێ و، بخوازێت رۆڵی خۆی لەناو ریزەکانی سوپادا پتەوتر بکات. پێویستە ئەمە بەوردی چاودێری بکەین. پێویستە ئەوە ببینین کە ئەمریکا چۆن دەخوازێت دەسەڵاتی خۆی لەناو سوپا و پارتیە بۆرژوازیەکان بسەپێنێ. تەنانەت لەناو بزووتنەوەی چەپیشدا و، لەسەر رووناکی ئەو پێشکەوتنانەی روودەدەن تەگبیری خۆمان بگرین، لە راستیدا پێویستە هەوڵەکانی ئەوروپاش بۆ ئەمە زیادبکەین، تەنها تێر ببین بە ووتنی ئەو: دیموکراسیە، با بەدوای دیموکراسیەتی ئەوروپادا بچین، ووتنێکی نەزۆکە و پێویستە لەبەرامبەریدا زۆر وشیار بین. ئەگەر مەسعود یەڵماز یان دەنیز بایکاڵ بخوازن دیموکراسیەتی ئەورپی بچەسپێنن، لە راستیدا دیموکراسیەتی هەردووکیان ئاشکرا بووە و، بۆ ماوەیەکە ریسوا بوون، پێویستە نەکەوینە ناو ئەو تەڵەیەوە، وەك دەبینین بارودۆخ و رێگاکان بەتەواوی بۆ ئۆپۆزیسیۆنی کۆمەڵایەتی کراوەن، لەسەرووی هەموو ئەمانەوە شۆڕشگێڕ و چەپ و سۆسیالیستەکانی تورکیا هەموویان بۆ ماوەیەکی درێژە لە رێگەی بەخشینی خوێنی خۆیان گرێدانیان بەگەل نیشانداوە، ئەو دروشمەی دەنیز گەزمیش لەسەر سەکۆی سێدارە بڵندی کردەوە: "بژی یەکسانی و ئازادی هەردوو گەلانی کورد و تورك" دروشمێکی بەدەنگە و هەرکەس لەبەرامبەریدا دەلەرزێت، بۆ هەمان هۆ پاراستن و گیانفیدای سۆسیالیستە تورکەکان لە راستی گەلی کورد، گرنگیەکی مەزنی هەیە، هەروەها هەزارن شەهید و دەیان هەزار زیندانی هەن کە هەموویان بەیەکەوە کۆی بەهاکان پێکدەهێنن.

**میهری بەللی:** پێویستە ئەوانەی بەسەختی برینداران لە یادیان نەکەین.

**عەبدوڵڵا ئۆچ ئالان:** ئەوانە میراتێکی گەورەن، هەرچەندە بڵاوبوونەوە هەیە بەڵام تائێستاش زۆر گروپ هەن کە لایەنی پۆزەتیف و میراتێکن بۆ ئێمە، کەواتە چیمان کەمە؟ پێش هەمووشتێك و لەجیاتی بەهێزکردنی ئەم یان ئەو پارتی، پێویستە ئەم میراتە لە بڵاوبوونەوە رزگار بکەین و، کۆردیناسیۆنێکی ناوەندی پێکبهێنین کە ئەو کارە بکات، بەوەی کە ئێمە هێزی یەکەمی نیشتمانی دیموکراسی کوردین، ئامادەیی خۆمان دەردەبڕین بۆ ئەو کارە لەچوارچێوەی پارتی دیموکراسی گەل ـ کە دەزانن ـ ئێمە پشتگیری لێدەکەین و، بنکەیەکی جەماوەری هەیە کە بەملیۆنان مەزەندە دەکرێت، لە راستیدا چەند ملیۆنێك لە هەڵبژاردنەکانی دواییدا بەدوو ملیۆن و دووسەد هەزار دانرا، لەکاتێکدا چەند جاری ئەوەش نەیانتوانی بەشداری هەڵبژاردن بکەن، ئەمە بنکەیەکی هەڵبژاردنی مەزنە. ئەگەر بەبیر بهێنینەوە کە ژمارەیەکی مەزن لەناو بەڵگە فەرمیەکاندا نەنووسراوە، بێگومان ئەم ژمارەیە لەپێنج ملیۆن زیاتر بڵند دەبێت، ئەگەر بنکەکەمانی لەتورکیا بخەیتە سەر، ئەوا ژمارەکە دەبێتە دەیان ملیۆن، بۆ ئەوەش گرنگە کە کۆردیناسیۆنێکی ناوەندی و بەتایبەت لەپێناوی پێشخستنی چالاکیەکانی رێکخستن کە ئێستا هەیە دابمەزرێنین، بەتایبەت ئەوانەی کە پارتی دیموکراسی گەل و پارتی ئازادی و دیموکراسیەت و پارتیەکانی دیکە رایدەپەڕێنن.

**میهری بەللی:** پارتی کاریش هەیە.

**عەبدوڵڵا ئۆچ ئالان:** پارتی کار و گروپەکانی دیکە کە تائێستاش نەبوونەتە پارتی، پێویستە کۆردیناسیۆنێکی ناوەندی پێکبهێنین کە هەموو پارتی و رێکخستنەکان لەخۆ بگرێت، بەو رەنگەش ئامادە دەبێت کە ببێتە هێزێکی مەزن، واتە ئێستا پێویست ناکات پارتی نوێ دابمەزرێنین، ئەو وزەیەی هەیە بۆ پێشخستنی کاری سیاسی و بڵاوکردنەوەی چاپەمەنی و سازدانی رێپێوانی ئاشتیانە بەشدەکات و، دەسەڵاتێکی بڕیار پێکبهێنرێت کە کارەکانی ناردن و بەڕێوەبردن پێشبخات، هەزاران کرێکار هەن ئامادەن بۆ کاری پراکتیکی و، دەیان هەزار ئامادەن بۆ خەباتکردن لەنێو ریزەکانی گەلدا، بۆئەوە پێویستە لەسەرمان کە کۆردیناسیۆنێکی ناوەندی پێکبهێنین و، کات لەدەست نەدەین بۆئەوەی ئەو وزە و بەهایانە، بەفیڕۆ نەچن و نەکەونە ناو تەڵەی نوێ، هیچ پێویستی بەبڕیاری لەپێشدا نییە، بۆچی؟ چونکە هەر لایەنێك دەتوانێت لەسەر رێبازی ئایدیۆلۆژی و کاری خۆی بەڕێدا بچێت.

**میهری بەللی:** بێگومان

**عەبدوڵڵا ئۆچ ئالان:** ئێمە گفتوگۆ دەکەین لەسەر هەنگاوێك کە بتوانێ هێزی هەموو لایەنەکان پتەوبکات.

**میهری بەللی:** بێگومان

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** ئەویش "کۆردیناسیۆنی ناوەندییە" ئەو چەترەیە کە هەمووومان لە رەشەبا دەپارێزێت و، من بە کۆڵەکەی سەرەکی خەباتی دادەنێم.

**میهری بەللی:** ئەمە راستە....

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** کۆڵەکە هەمووومان دەپارێزێت لە کەوتنی خێوەتەکە، لە سێبەری ئەودا هەرکەس دەتوانێ بەئازادانە کار بکات و پێشبکەوێت، لەم سەرەتاگەیەوە: کۆردینە بەواتای چی دێت؟ ئەوە شێوازێکە کە نمونەی نییە.

**میهری بەللی:** ئەوە رێرەوی رزگار بوونە لە بچووك بوونەوە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** بەڵێ ـ تاکە رێگایە.

**میهری بەللی:** بەجەماوەری بوون.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** لەبەرامبەر تەڵە خۆپاراستن و، ونکردنی هێز لەشوێنی بێ مانادا و، بەتەنیا نەماین.

**میهری بەللی:** راستە.

**عەبدوڵڵا نۆچ ئالان:** وای دەبینم هەر کەس کارەکانی خۆی پێك بهێنێت و هەرکەس بەگوێرەی توانا و وزەی چەند بێت بەشداری بکات، ئێمە لێرەدا مەرجی پێشینەمان نییە و، پێویست بەهێنانەوەی بیانوو نابینین کە پارتی کرێکارانی کوردستان بیسەپێنێت. بەهێزی جەماوەری خۆمان پشتگیری دەکەین هەروەك چۆن پشتگیریمان دایە پارتی گەلی دیموکرات، سۆسیالیستە تورکەکانیش پێویستە یارمەتی کرداری بن، بۆ هەموو شێوازەکانی ئۆپۆزیسیۆنی گەلێری.

لەگەڵ ئەوانەشدا پێویستە هەمووومان کار بکەین بۆ بەهێزکردنی دەزگاکانی تێکۆشانی جەماوەری، لەپێشەوە ئاماژەمان پێکرد کە پێویستە کۆردیناسیۆنی ناوەندی بلاوکراوەیەکی ناوەندی هەبێت کە زمانحاڵی بێت، تەنانەت رادیۆیەکی تایبەت دابنێت، ئەمانە هەموویان پێویستن، لەهەمانکاتدا یەکەمین شوێنی تێکۆشانی گەلانمان دەبێت لەسەر بناخەی ئازادی و یەکسانی هەروەها بەواتای دەرکەوتنی یەکێتی گەلانمان دێت، یەکێتییەکی ئارەزوومەندانە لەهیوا و ئاواتەوە ببێتە راستی و بگۆڕێ بۆ هێزێکی مەتەریالی. لەکاتێکدا پارتەکانی رژێم بەرەو دواوە دەچن و وردە وردە هێزی خۆیان لەدەست دەدەن و ئۆپۆزیسیۆنی گەلێریش رۆژ لەدوای رۆژ بەهێزتر دەبێت. من لێرە باس لە تیۆری ناکەم، بەڵکو رێباز، من باسی پراکتیك بۆ خۆی دەکەم، چونکە هێزێکی کوردی تێکۆشەر و زۆر زیندوو لەپێناوی ئازادیدا هەیە و هەروەها ئۆپۆزیسیۆنێکی کۆمەڵایەتی کە گەیشتۆتە ئاستێك

پێشی ناگیرێت لەنێو گەلی تورکیادا، کۆکردنەوەی ئەمانە هەموویان بەواتای دیموکراسی دێت، بۆ یەکەمین جار بواری سەرکەوتنی دیموکراسیەت لەتورکیادا دەڕەخسێت. ئەمەش پێویستە بەگەرمیەوە سڵاوی لێ بکەین.

**میهری بەللی:** بەڕاستی بۆ یەکەمین جارە لەمێژوودا.

**عەبدوڵڵا ئۆچ ئالان:** بۆ یەکەمین جار تامی دیموکراسی دەکەین.

**میهری بەللی:** بێگومان.

**عەبدوڵڵا ئۆچ ئالان:** با بە ئاشکرایی پێتان بڵێم: کاری ئێمە تورکیای هێناوەتە لێواری دیموکراسیەت، زۆر لەناوەندەکان دان بەمەدا دەنێن "پارتی کرێکارانی کوردستان پارچەیەکی جیانەکراوەیە لە دیموکراسیەتی تورکیا" زۆر ناوەند دەرکیان بەمە کردووە لەناویاندا سوپاش، ئێمە دوژمنایەتی تورکەکان ناکەین بەڵکو دژی وەرچەرخانی فاشین کە تورکیا دەخنکێنێت و دوژمنایەتی دیموکراسیەت دەکات، خۆشەویستی ئێمە بۆ تورکیا ــ کە بەبەردەوامی دووپاتم کردۆتەوە ـ لە خۆشەویستی دەستە فاشیەکان بڵندترە با هەر کەس بزانێ کە ئەو فاشیانە مار و دووپشکی بکوژی تورکیان، ڕۆژێك دێت هەموویان بچن بۆ ئەمریکا، لەکاتێکدا ئێمە هەمووومان لەتورکیا دەمێنین و تا سەر تیایدا دەژین. ئەگەر پێویست بێت هەڵسەنگاندنی پارتی کرێکارانی کوردستان بۆ تورکیا بکەین، دەکرێت بڵێین: بزووتنەوەی نیشتمانی دیموکراسی کوردستان ئاوێنەی دیموکراسیەتی تورکیایە، هەروەها وەك ئامادەتان پێکرد پێوانی دیموکراسیەکەیەتی و، پشتگیری راستی گەلی تورکیایە کە دەسەڵاتداران لە ڕۆژئاواوە دەخوازن لەناوی ببەن، هەروەك چۆن لەمێژوودا دووبارە بۆتەوە. گەلی تورك ئەمجارەش ناتوانێت دەست لەگەلی کورد بەربدات. چونکە ئەمڕۆ جیاوازییەکی گرنگ هەیە، ئەویش سەرکەوتنی ئۆپۆزیسیۆنی گەلێری و شۆڕشگێڕان و بزووتنەوەی گەلێرییە. ئەمڕۆ گەلی تورك زۆر پێویستی بە گەلی کورد هەیە کە مەزنترین نمونەیە بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانێتی لە ڕێگەی ئەو وشیارییە نیشتمانییە دیموکراسیە مەزنە و ئەو گیانفیداییە مەزنەی کە پێشکەشی دەکات. ئەمەش پێویستە ڕێز و سڵاوی لێبکرێت.

ئەمەیە کە ناوی لێدەکەم "وەرچەرخانی مەزن". گەلەکانمان لەسەر بناخەی ئازادی و یەکسانی بگەنە یەکتری و من هەست بە جۆش و خرۆشێکی مەزن دەکەم و وای دەبینم بواری سەرکەوتن زیادی کردووە و نزیك بۆتەوە، چونکە ڕۆژ بەڕۆژ دەکەوێتە واری کرداری و لەسەر بناخەیەکی نوێ بە ناسنامەی ڕاستی خۆی و داوا نەتەوەیی و چینایەتیەکان، هەموو ناوەندەکان لەپێشیانەوە سوپا لەو باوەڕییەدان کە هیچ ڕێگەیەکی تر نەماوە، کاری ئێمە

لەم خاڵەدا بێگومان پێشگرتنی ئەم وەرچەرخانە نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بونیادنانی ڕێکخستن و چوارچێوە و هاوێشتنی هەنگاوە تاکتیکییەکانە. لەو پێناوەدا ئێمە نرخێکی گرانمان دا کە بەفیڕۆ نەچوو، تەنیا ئەوە ماوە بەرەو سەرکەوتنی ببەین.

لەسەر ئەم بناخەیە و بەم بۆنەیەوە ئەم چاوپێکەوتنە بەنرخ دەبینم و لەکەسایەتی و ناسنامەی شۆڕشگێڕی مەزنی سۆسیالیستی ئێوەدا سڵاو دەکەم لەهەموو شەهیدانی شۆڕشی تورکیا و شۆڕشگێڕەکان و ڕێزم بۆ هەموو گروپەکانی ڕێکخستن هەیە و، سەرلەنوێ هیوا و باوەڕی گەورەی خۆم دەردەبڕم لە پێکهێنانی شۆڕشگێڕان بۆ کارەکانیان و داوا بۆ هەمووان دەکەم کە سەرکەوتنی مەزن بەدەست بهێنن و سڵاوی گەرم و ڕێزیان پێشکەش دەکەم.

**میهری بەللی:** هەروەها منیش.